زانکۆی سەلاحەددین
کۆلیجی ئاداب

# ڕێزمانی کوردی



## بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی
## زانکۆی سەلاحەددین

دانانی
دکتۆر نەسرین فەخری و دکتۆر کوردستانی موکریانی

١٩٨٢

زانكۆی سەلاحەددین
كۆلیجی ئاداب

# ڕێزمانی كوردی

بۆ پۆلی یەكەمی بەشی زمانی كوردی
زانكۆی سەلاحەددین

دانانی
دكتۆر نەسرین فەخری و دكتۆر كوردستانی موكریانی

١٩٨٢

# پێشـــــــــەكی

ئەم بەرهەمە ڕێزمانی‌یە یەكێكە لەو كتێبانەی ، كە بە پێی نەخشەی لیژنەی دانانی پرۆگرامــە یەكگرتووەكانی بەشی زمانی كوردی دانراوە ، كە بریتیە لە دوو پــار ، یەكەمیان لە ووشەی زمانی كوردی دەكۆڵێتەوە • دووەمیان لە بەشەكانی ئاخافتن •

پاری یەكەم و بەشی یەكەم و دوەم و سێیەم لە پاری دووەمدا لە لایەن دكتــۆر كوردستان موكــریانی • وە بــەشی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم و هەشتەم لە پاری دووەمدا لە لایەن دكتۆر نەسرین فەخری‌یەوە داندراوە •

هیڤی‌داریــن هــــەرچ كەم‌وكورتی‌یـــەكی لــەم بەرهەمــە ڕێزمانی‌یــەدا بەرچــاو دەكــەوێ ئــاگادار بكرێــین ، پێشــەكی سوپاسبژێری هەموو كەسێكی هاوكارین •

نووسەران
١٩٧٨/٥/٣٠

## بەشی یـــــەكەم

### پاری یەكەم :

### ووشـــــە :

ووشە دەنگێكە یا كۆمەڵە دەنگێكە ، كە پێك‌هاتنی فۆنۆلۆژی واتاداری هەبێ و وەك دانەیەك لە زماندا بەكاربێت •

### باسی یەكەم

### جۆری ووشە :

لەبەر ڕۆشنایی زانستی ووشەدا ، ووشەكانی زمانی كوردی لە ڕووی ســەربەخۆیی و ناســەربەخۆیی بەخشینی واتــاوە دوو جۆرن :

### یەكەم : ووشەی سەربەخۆ

ووشەی سەربەخۆ ئەو بەشە ئاخاوتنەیە ، كە هیچ زیادی‌یەكی پێوە نەلكاوە • بوونی سەربەخۆ و واتای تەواوی هەیە •

ووشەی ســەربەخۆ ئەو ووشانەیە ، كە واتــای دیاردەیەكی بابــەتی و چۆنیـــەتی جۆراوجــۆر دەبــەخشێ وە لـــە ڕووی

مۆرفۆلۆژییەوە ئەم ووشانە دەگرێتەوە :

ناو ، ئاوەڵناو ، جێناو ، ژمارە، کار ، ئاوەڵکار ٠

## دووەم : ووشەی ناسەربەخۆ (بەستراو)

ووشەی ناتەواو ئەو ووشەیەیە ، کە واتا و بوونی سەربەخۆی نی‌یە ٠ وە پێوەندی بە دیاردەی واقعی‌یەوە نی‌یە ٠

ووشەی ناسەربەخۆ لە ڕووی بەکارهێنانیەوە دوو بەشە :

**١ ــ ئەو ووشــە ناسەربەخۆیانەی ، کە لە ڕســتەدا دەور دەبینن ، وەك :**

**آ ــ ئامرازی پێوەندی ، بۆ وێنە :**

ئەسپەکە ملی زۆر جوان بۆ دەنگەکە درێژ کرد ٠

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١١)

لالۆ ووتی : هەر لە ئێوارەوە لەشم ناکۆکە ٠

(لالۆ کەریم ــ ٢٨)

پاڵتۆکەی بە دیوارەکەدا بە ڕێکوپێکی هەڵواسی ٠

(پاڵتۆ ــ ٤١)

**ب ــ ئامرازی پێوەست :**

لالۆ کە ووشەی سوێندی هاتە گوێ ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و بە دەنگێکی پەشۆکاوەوە ووتی :

**جـ ــ ئامرازی بانگکردن و سەرسوڕمان :**

وای کە پیاو بە لێقەومان کزە !

**٢ ـ ئەو ووشە ناسەربەخۆیانەی ، کە لەگەڵ بەشەکانی ئاخاوتندا دەور دەبینن :**

**آ ـ مۆرفێم (ناو) + بەند (پاشگر)**

| | |
|---|---|
| ئاش + ـ ەوان | ئاشەوان |
| ئاسن + ـ گەر | ئاسنگەر |
| نیسك + ـ ێنە | نیسکێنە |
| بەرد + ـ ەڵان | بەردەڵان |

**ب ـ بەند (پێشگر) + مۆرفێم (ناو)**

| | |
|---|---|
| بێ + کەس | بێکەس |
| بە + هێز | بەهێز |

**ج ـ بەند (پێشگر) + مۆرفێم (ئاوەڵناو)**

| | |
|---|---|
| نا + پاك | ناپاك |
| نە + خۆش | نەخۆش |

**د ـ بەند (پێشگر) + مۆرفێم (چاوگ)**

| | |
|---|---|
| لێ + نان | لێنان |
| تێ + خستن | تێخستن |
| هەڵ + هێنان | هەڵهێنان |
| تێك + دان | تێكدان |

ووشە لە ڕووی پێكهاتن و دارِشتنەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە :

**١ ـ سادە :**

ووشەی سادە لە تاکە ووشەیەك پێكدێت ، کە بۆ دارِشتنی

هیچ بەندێکی پێوە نەلکابێ ، وەك :

ڕۆژ ، ڤیان ، سێو ، گوڵ ، ڤالا ...

## ٢ ـ ناسادە :

ووشەی ناسادە سێ جۆرە :

### آ ـ ووشەی داڕێژراو :

ووشەی داڕێژراو ئەو ووشـــەیەیە ، کە لە ووشەیەکی سادەی سەربەخۆ و پێشگر وەیا پاشگرێك داڕێژرابێ ، وەك :

بەهێز ، بێبەش ، برایەتی ، باخەوان ...

### ب ـ ووشەی لێکدراو :

ووشەی لێکدراو لە دوو ووشەی سەربەخۆ پێك دێ :

گوڵبەهار ، گوڵاو ، نێونیشان ، بووکەشووشە ، ڕەشەبا ، کێلەشین .

### ج ـ ووشەی ئاوێتە :

ووشەی ئاوێتە لە ووشەیەك یان دوو ووشەی ناسەربەخۆ و دوو ووشەی سەربەخۆ پێك دێ :

پێ لێ هەڵگرتن ، دەست پێ کردن ، سەرلێ دان .

## باسی دووەم :

## دابەش کردنی ووشە بەسەر بڕگەدا :

هەر ووشەیەك ، یەك یا چەندین بڕگەی هەیە ، هەر بڕگەیەش لە پیتێکی دەنگدار وە پیتێك وەیا دوو پیتی بێدەنگ پێك دێت .

ووشەی یـــەك بڕگەیی ، کە لـــە پیتێکی بێدەنـــگ و پیتێکی دەنگدار پێك هاتووە :

با ، كا ، چا ، ڕێ ، زێ ، دێ ، دۆ ، دوو ...

ووشەی یـەك بڕگەیی ، كە لە پیتێكی دەنـگدار و دوو پیتی بێ دەنگ پێك هاتووە :

گوڵ ، نان ، سەر ، پاك ، ژار ، ژین ، ڕۆژ ...

ووشەی یەك بـڕگەیی ، كە لـە پیتێكی دەنگـدار و سێ پیتی بێ دەنگ پێك هاتووە :

كورد ، مەرد ، بەرد ، سارد ...

### ووشەی دوو بڕگەیی :

چاكە : چا + كە .

هەنار : هە + نار .

سیروان : سیر + وان .

### ووشەی سێ بڕگەیی :

دارەتوو : دا + رە + توو .

سەماوەر : سە + ما + وەر .

لالەزار : لا + لە + زار .

### ووشەی چوار بڕگەیی :

دامەزراندن : دا + مەز + ران + دن .

پەڕەسێلكە : پە + ڕە + سێل + كە .

مۆرفۆلۆژی : مۆر + فۆ + لۆ + ژی .

### ووشەی پێنج بڕگەیی :

كۆلكەزێڕینە : كۆل + كە + زێ + ڕی + نە .

دەستلێهەڵگرتن : دەست + لێ + هەڵ + گر + تن .

# بەشی دووەم

## بەشەکانی ئاخاوتن

### پاری دووەم :

### نـــاو

ناو : ئەو بەشـــەی ئاخافتنە ، کە ، کە تیگـــۆری ڕێزمانی ، ناسیاری ، نەناسیاری ، کۆ ، ڕەسەن و دۆخ دەگرێتە خۆی ٠

جۆرەکانی ناو لە ڕووی پێك‌هاتنەوە دوو جۆرە :

١ ــ سادە ٠

٢ ــ ناسادە ٠

١ ــ ناوی سادە : ئـــەو ناوەیـــە ، کـــە تـــەنێ لـــە ووشەیەك پێك‌هاتبێت ، وەك :

دیسانەوە لێوە لەرزۆکەکەی خستەوە کار ٠

(لالۆ کەریم ــ ٥٤)

لەم هەرێمانەدا کەسی وا نەبوو ئەسپ بەو ڕەنگە بڕازێنێتەوە

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١١)

منیش دەم‌و پلم خواتەوە ئەڵێی ئاو لای‌داوم •

٢ ــ ناوی ناسادە : ئەو ناوەیە لە ووشەیەك و بەندێك پێك‌هاتبێت ، بەندەکە لەوانەیە پێشگر وەیا پاشگر بێ هەروا ئەم جۆرە ناوە ناسادەیە بەهۆی لێکدانی دوو ووشەش دادەڕێژرێ •

لە ڕووی پێناسەی سەرەوەدا ناوی ناسادە دەکرێت بە دوو بەشەوە :

یەکەم ــ ناوی داڕێژراو •

دووەم ــ ناوی لێکدراو •

یەکەم ــ ناوی داڕێژراو : ئەو ناوەیە ، کە بە یارمەتی بەندێك دادەڕێژرێ •

بۆ پێك‌هێنانی ناوی داڕێژراو هێندێ پاشگر هەن ، کە دەچنە سەر (ناو ، ئاوەڵناو ، کردار)ی سادە و دەیکەنە ناوی داڕێژراو •

١ ــ ئەو ناوە داڕێژراوانەی لە ناوی سادە دادەڕێژرێن :

آ ــ ئەم پاشگرانە (دار ، بەند ، وان / ەوان ، گەر ، ساز ، چی ، کەر ، مەند ، باز و ••• هتد) دەچنە سەر ناوی سادە و ناوی داڕێژراوی لێ سازدەکەن •

١ ــ دار • وەك :

چاوەکەم خۆمن برینداری خەدەنگی چاوی تۆم
زار و بیمار و گرفتاری کەمەند و داوی تۆم

(کوردی)

هەردوو دڵداریش لە ژێر هەوری ئەوینی زێڕین وەدەرکەوتن

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ٨٩)

باڵدار بە باڵ دەفڕێ بنیادەم بە برادەر ·

(پەندی کوردی ــ ٢١)

بەگــــزادە و پاڵــــەوان و ســــەردار
هی گــورز ــ گــران و ســوکەڵە سوار

(مەموزین ــ ٦٥)

٢ ــ بەند · وەك :

لە کوێستانان دەپشکوتنەوە هــەڵاڵ و بەیبون و گییابەند و خاوە ·

(شێخ فرخ و خاتو ستی ــ ٦٧)

بە بیروڕای هەموو حەیران بێژەکان ئەگەر ئەم سەربەند و دوا بەندە هەر هورێنەی منداڵانەی پێ دەڵێن ·

(گ· ئ· ڕۆشنبیری نوێ ــ ٤٢/٦٣)

کوڵمی گــوڵ و لێــوی قەنــدی دڵبــەند
تێــکەڵ دەبــــو دەم بــە دەم گوڵوقــەند

(مەمو زین ــ ٥١)

٣ ــ وان /ەوان · وەك :

ئاش هەر هەندەی دەینی ئاشەوان بچەپینی ·

(پەندی کوردی ــ ١١)

دەڵێی کاروانی جــەردە لێــدراوی
دەڵێی هەڵاڵــەی بن هەڵکەندراوی

(بارام و گوڵئەندام ــ ٣٥)

ئەهلی جەننــەت نــە شوان و گاوانــە
ســاحیبی عیلــم و فـــەن و عیرفانــە

(حاجی قادری کۆیی)

لەنــاو گێژاوی گــەردوشی دەوران
بە نەپەشــۆکان ئەبی‌یــە مەلــەوان

(لە پەندەکانی پیرەمێرد ــ ٣٣)

٤ ــ گەر ٠ وەك :

دەنێو عەشرەتی کێلەسێپانیٚدا ئاسنگەرێك هەبوو ٠

(خەج و سیامەند)

دەتوت کە دوو زێڕگەری هونەروەر لێکیان گرێداوە جوتی گەوهەر ٠

(مەم و زین ــ ٥١)

٥ ــ ساز ٠ وەك :

وەك دەرمانســاز بۆ (٧٥٠) فلس پیاوێکی بیٚکــەس بخاتە قولاّیی بەندیخانەوە ٠ (ئایا گوناهبارە) ٠

٦ ــ چی ٠ وەك :

سەدای کاروانی فرقــەت دیٚ دەلێن ســەرقافلّەچی یارە
زرەی پێشــەنگی محنت دیٚ ، دەلێــن کــالاّی غەمبــارە

(کوردی)

٧ ــ کەر ٠ وەك :

پیاوەکە چێشتکەرێکی خەلّکی یۆلیۆی بوو ٠

(گ٠ بەیان ــ ٣٧/٢٦)

ئیشکەری خۆتی ، خۆشەویستی خەڵکی ٠

(پەندی کوردی ـ ٢٠)

٨ ـ مەند ـ وەك :

هەیامەکی هونەرمەند اسکند کەمان بۆ لێ‌ددا ٠

(هاوکاری ـ ١٠٩١/٧)

ئەگینــە دیــارە پیـــاوی دەوڵەمەنــد
پارەی خــۆی بەکەس نــادا بێ‌گۆبەند

(لە پەندەکانی پیرەمێرد ـ ١٢٩)

٩ ـ باز٠ وەك :

سەد خۆزگەم ئیســتا سەربازێك دەبووم
بەگـــژ دوژمـــنی وولاتدا دەچـــووم

(خوێندنەوەی کوردی)

ب ـ پاشگری (ی ، ەتی ، ێنی ، ـ ێتی ، ـ ایەتی) دەچنە سەر ناوی سادە ٠ ناوی داڕێژراوی گوزارەیی پێك‌دێنن وە واتای ئەبستراکت دەبەخشن ٠

١ ـ پاشگری ـ ی ٠ وەك :

جووانی ، تاك و تــەرای گــوڵی پاییــزیی وایــان لێ‌کردم بیان‌چنم ٠

(هاوکاری ـ ٣٩٥)

پاشگری ـ ی دەچێتە سەر ناوی داڕێژراو و ناوی گوزارەیی پێك‌دێنێ وە واتای ئەبستراکت دەبەخشێ :

فریشتەی دڵداری گریا کە گریا ژنی وەك پەری ٠

(کامەران)

٢ ــ ـ ەتی ٠ وەك :

برایەتی کــورد و عــەرەب زۆر کۆنە مێــژوو شاهیدە

دوژمنی ناحــەز لــە داخــا بــا یەخــەی خــۆی دادڕێ

(بێکەس)

هەرگیز پیاوەتی مامەی باخەوان لە یاد ناکەم ٠

(هاوکاری ــ ٣٦٢)

٣ ــ ێنی ٠ وەك :

کابرای زاوا پــارەی نــارد بۆ مــاڵی بــووکێ ، کــە جیازی بووکێنی بۆ بکڕن ٠

(ڕشتەی مرواری ــ ١٦١)

٤ ــ ێتی ٠ وەك :

ئەو لەسەر دزێتی لە کار دوور خراوەتەوە ٠

(هاوکاری ــ ٣٥١)

٥ ــ ایەتی ٠ وەك :

دایکی ووتی : دۆستایەتی ماسی و شەیتانۆکەمان نەبیستووە ٠

(ماسی‌یە بچکۆلەکە)

ماسی‌یــە بچکۆلــەکە ووتــی : منیش دوژمنــایەتی مــاسی و شەیتانۆکەم نەبیستووە ٠

(ماسی‌یە بچکۆلەکە ــ ٦)

جـ ــ پاشگری (گه ، ــ گا ، ــ خانه ، ــ ستان ، ــ دان ، ەوار) دەچنه سەر ناوی ساده و ناوی داڕێژراوی لێ پێكدێنن وه بەشێوەیەكی گشتی شوێن و جێگه پێشان دەدەن •

١ ــ ــ گه • وەك :

چەند ماڵێكی لادێیانه و چەند كارگەیەك دەركەوت •

(پاڵتۆ ــ ٤٨)

ئارەزوو هەبێ ڕێگه ئاسانه •

(پەندی كوردی)

ئادەم له قوڕی پتر نەبووگه وێستت له فریشته بوو به رووگه

(مەم و زین ــ ٧)

٢ ــ گا • وەك :

كاتی نیوەڕۆ بوو ، كه له دادگا دەرچوون •

(ئایا گوناهباره ــ ٤٦)

له شارەكاندا بازاڕی گەوره و كۆگای زۆر هەیه •

(پەروەردەی نیشتمانی)

٣ ــ ستان • وەك :

تەنێ (تەنیا) له كوردستانی عیراق و سۆڤێتدا زمانی كوردی ئازاده •

بڵاوكردنەوەی سوودەكانی دارستان لەناو جووتیارەكاندا •

(هاوكاری ــ ٣٦١)

گوڵئەنـدام و فیـدا سـازكه هەرتكیـان
بـه دییـاری بییانبـەم بـۆ فەڕەنگستان

(بارام و گوڵئەندام)

٤ ــ دان ٠ وەك :

حیکایەتی شــەوانی درێــژی گوێی ئاگــردان و ئەفسانەی کوردی ٠

(هاوکاری ــ ٣٩٣)

ئەگەر کا هی خۆت نییە کادان هی خۆتە ٠

(پەندی کوردی)

سەهۆڵدان و جلشــۆر و کەرەسەی تری کارەبــا و مەکینەی دانەوێڵە و شتیتر دەفرۆشن ٠

(پەروەردەی نیشتمانی ــ ٧٧)

٥ ــ ــەوار ٠ وەك :

هەتا ئەمڕۆ شوێنەوارەکەی لە نزیك قوتابخانەی (نیزامیە)وە هەر ماوەتەوە ٠

(پەروەردە ــ ٣١)

د ــ پاشگری (ــ لە ، ــ ڵە ، ــ ۆڵە ، ــ ۆلە ، ــ وولە ، ــ وڵە ، ــ یلە ، ــ ۆکە ، ــ چە ، ــ چکە ، ــ وولکە ، ــ یلکە ، ــۆل ، ــ ۆڵ ، ــ ەل ، ــ وو ، ــ وك ، ــ و) بە شێوەیەکی گشــتی بــۆ بچووككردنــەوە بــەکاردێت لەوانەیــە هێندێکیان واتای دیش ببەخشن ٠

١ ــ ــ لە ٠ وەك :

مێروولە بە قاچیا هەڵگەڕا ٠

(١٠ چیرۆك ــ ١٦)

٢ ــ ڵە • وەك :

بۆ بەختی خۆم کوزەڵەکە لەسەر بانێژەکە دانرابوو •

(١٠ چیرۆك ــ ٣٦)

٣ ــ ۆڵە • وەك :

لە پێناوی منالێکدا کە وەك ئەو کیژۆڵەیە نەیئەناسی •

(فریشتەکانی ئاسمان ــ ١٠)

٤ ــ ۆلە • وەك :

منالەکان و بەرخۆلــەکان و کۆتــرە کێویلەیەك لەژێــر ئەو درەختەدا بوونە هاوڕێ •

(پیاوی بچکۆلە ــ ٧)

٥ ــ ــ وولە • وەك :

نە مێشوولە هەبوو توخنی کەوێ

نە با ش دەستی بۆ پەلك و پرچی دەبرد •

(پرچی ئەو کچە ــ ٦٢)

٦ ــ وڵە • وەك :

دەنگی زەنگوڵە و کوس و کەڕەنای قەتار دەهات •

(بارام و گوڵئەندام ــ ٨٤)

٧ ــ ــیلە • وەك :

ئەنگوستیلەی ئــاڵ چــون لەعلی روومــان

مەتای ڕەنــگاوڕەنگ ، بە قیمــەت گــران

(بارام و گوڵئەندام ــ ٧٧)

٨ ــ ـۆكە · وەك :

له بزنـۆكه و مـەڕۆكه و سـەربهوردیان
گەلێ دڵخۆش دەبـوم دەمبیست ڕەوشـتیان

(چیرۆکی بزنۆکه و مەڕۆکه ــ ٥)

٩ ــ ــ چە · وەك :

دارستان و باخچەکان لە سەردەمی بەهار و هاوینان جوانتر ئەبن ·

(بووکە شووشە ــ ٨)

١٠ــ ـچکە · وەك :

گوێچکە ماسی‌یەك هەبوو زۆر حەزی لە مانگٹ دەکرد ·

(ڕۆشنبیری نوێ ــ ٧٢/٦٣)

ئایا دەزانی بۆ کوێ ڕێچکەی ژیانمان گرتۆتەبەر ·

(ڕۆشنبیری نوێ ــ ٤٧/٦٣)

١١ــ ولکە · وەك :

دەیدی کا لەبن سەریانە جامولکە جامولکە دەشیرنە بەفراوی ·

(خەج و سیامەند)

١٢ــ ــ یلکە · وەك :

چاویلکە لە سەری نەئەوەستا ·

(ڕاوە بەران ــ١٨)

دە وێنەکانی ناو ئەم پەراویلکەیەش نموونەیەکن لە پلەی هونەرمەندێتی وی لە نیگارسازێتی‌دا ·

(خۆشی و ترشی ــ ٢)

١٣ ــ ول • وەك :

مەجۆلی خاڵۆزاشم ئاگاداری ڕووداوەکەیە •

(هاوکاری ــ ٢٨٢)

١٤ــ ــ ۆڵ • وەك :

ناچاربــووم ئاســكۆڵی خوشـــكیشم ڕاکێشــمە نــاو داوی درۆکەمەوە •

١٥ــ ــ ەڵ • وەك :

دوور لە چــاوی ڕەنجــدەران لــە پشت کۆمەڵــە خەرمانێك دانیشتبوون •

(هاوکاری ــ ٢٩٤)

١٦ــ ــ وو • وەك :

لە حەســرەت ســەرووی قەدت چــاوی ناڵی
دوو جۆگــە ، بەڵکو دوو ڕووبــارە بێ تۆ

(نالی)

١٧ــ ــۆك • وەك :

چی ئەبێ ئەگەر بیکەینە سەرۆکی شارەوانی ؟

(ڕەنجی کرێکار ــ ١/٣٠)

١٨ــ ۆ • وەك :

کوردۆ دەنووسێ ئازاد دەخوێنێ •

هـ ــ ئــەو پاشگرانــەش دەچنــە سەر نــاوی جێو نــاوی دارێژراوی لێ دادەڕێژن :

- ـ ین • وەك :

چی باشی دەبێ و چهات لە پێشـــین
چی باوەڕی پێت هەیە و چە بێدین •

(مەم و زین ـ ٦)

٢ ـ ار • وەك :

کە چووشمە سەر لوتکەی ووشە
سەرنجی بن بنارم دا •

(کازیوە ـ ٥٥)

٣ ـ ەوا • وەك :

پێشەوای کاروانی بێڕەحمی هەتـا ماوی ئەتۆی
هەڵگری بـاری جەفا و هیجران هەتا دەمـرم منم

(کوردی ـ ٢١)

و ـ ئەم پاشگرانەی خوارەوە دەچنە سەر ناوی سادە و ناوی داڕێـژراوی لێ دادەڕێـــژن و واتـای جـۆراوجۆر دەبەخشن :

١ ـ زار • وەك :

بە خوێن بێ دڵ ، بە گەرمی بێتە سەر جەرگت
ئەگـەر بێت و دڵم شـادبێ بە ••• گوڵـزار

(سالم)

پەپوولەیەکی چووکە هۆی باس و نەوا و ڕاز بوو • بتەنێ لە لالەزار بوو •

(هاوکاری ـ ٣٩٣)

٢ ـ ێن • وەك :

کۆمەڵی یەکـەم لە ناوێك یـان دووبارە کردنـەوەی پێك دێت • ئەگـەر یەك بڕگەیی بوو+پاشـگری (ـ ێن) وەك : بەر بەردێن • تۆپ تۆپێن •

(ئاسۆی زانکۆیی ـ ١/٥٨)

٣ ـ ینە • وەك :

وەکو شێرە بەفرینە بێت جوولەی بۆ نەئەکرد •

(ئاسۆی زانکۆیی ـ ٥)

دۆینە بێ و دۆغاوە بێ و شاژن لێی نابێ •

(پەندی کوردی ـ ٤٨)

٤ ـ ێنە • وەك :

نیسکێنە قاپ و کەوچك ئاوێنە •

(پەندی کوردی)

٥ ـ لان/ەلان • وەك :

ناوچەیەکی شاخاوی و بەردەلانە بۆیە هیچی لێ شین نابێ •

(جوگرافی‌یە)

لە خەوا کەوتمە کەندەلانێك •

(هاوکاری)

٦ ـ ـ ك • وەك :

خۆم هاویشتە سەر ملی و دەستم بە پەتکەکەی گرت •

(چیرۆکی کەڵەباب ـ ٥)

گوڵندام ڕۆژی دەسکێك گوڵ دەنێرێ ٠
(بارام و گوڵئەندام ـ ٣١)

٧ ـ ـ کە ٠ وەك :

من چۆن لە کچێك دەتۆرێم
ئاوی وەندی هەڵمژی بێو
ڕوانیببێتە لووتکەی بەمۆ ٠٠٠ ؟

(پرچی ئەو کچە ـ ٥٤)

ئەو دەستەی بۆ دزێتی پووشـــکەیەکی نیشتمانەکەمان درێژ دەکرێت لە قۆڵەوە ببڕین ٠
(پەروەردە و زانست ـ ١٣٠)

٨ ـ ـ کار ٠ وەك :

ئەگەر بهاتایەو کارەساتی ڕۆژگار لـــەم جیهانە بێفەڕڕەدا خۆی نەگەیاندایە موستەشارە هەقیقیەکان ٠
(پاڵتۆ ـ ١٥)

هەموو ڕۆژێ یەخەی ئەلبۆمی یادگار ئەترازێنم ٠
(هاوکاری ـ ٣٦١)

٩ ـ ـ وانە ٠ وەك :

حەزم ئەکرد گوڵی باخان بکەمە ملوانە تا گەردنی بێگەردی خۆتی پێ بڕازێنیتەوە ٠

گورزنی بای پرچ و کلکی دەسماڵ و کۆڵوانەی کیژۆڵان ٠
(خەج و سیامەند)

١٠ــ ــ وەر • وەك :

جرو جانەوەر و دڕندەش زۆرە •

(ڕشتەی مرواری ــ ٧٧)

١١ــ ــ ین • وەك :

ئاشنای شەوی بێداری یەکترین

وەك سەرسەرین شەوێ سەر ناخەینە سەر سەرین

(پیرەمێرد)

١٢ــ ــە • وەك :

ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە •

( پەندی کوردی)

١٣ــ ــانە • وەك :

جێژنانەکەم لێبڕاوە لەم نەورۆزە چی خەرج کەم چیم نەماوە •

(هاوکاری)

تەنانەت گەلێك باج و سەرانەشی لەسەر لاداوە •

(پەروەردە ــ ١٥٦)

١٤ــ ــ مەنی • وەك :

پێشەکی وتارەکە هەڵەی چاپەمەنی زۆر تێدایە •

(بەیان ــ ٨)

١٥ــ ــ ندە • وەك :

هەر باڵندەیێ بەسەر ماڵمانا تێپەڕێ

نامەیێ لەو بە دیاری بۆ من هەڵگرێ •

(رۆشنبیری نوێ ــ٦٣)

١٠ــ ــەوا • وەك :

نان بۆ نانەوا گۆشتیش بۆ قەساب

(پەندی کوردی)

١١ــ ــ اك • وەك :

کێ بێ کە ببێ لە ئێوە بێباك کێ بی کە نەدات بە ئێوە پیتاك

(مەموزین ــ ٣٣)

پێشگری ــ هاو ــ دەچێتە سەر ناوی سادە و ناوی داڕێژراوی نێ پێك دێ :

بڕایەوە ئیتر برادەری من نییە • من • من •• ببڕای ببڕای بە هاوڕێی دابنێم •

(ڕاوە بەران ــ ١٤)

هەمیشە خۆیان بە دۆست و هاوڕاز و هاودەنگ و هاوزانی خەڵك زانیوە •

(هاوکاری ــ ٣٦٦)

٢ ــ ئەو ناوە داڕێژراوانەی لە ئاوەڵناوی سادە دادەڕێژرێن •

ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و ناوی داڕێژراوی لێ پێكدێنن ئەمانەی خوارەوەن ، لێرەدا ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە ، کەوا هێندێك لەو پاشگرانە ناوی داڕێژراوی گوزارەیی (ئەبستراکتی) دادەڕێژن وەك : (ــ ی ، ــ ەتی ، آیی ، ێتی •••) •

١ ــ ــی ٠ وەك :

بڵندی و سەرفیرازی گەر بە ڕیشە ٠
بزن گەورەترینی کارو ئیشە

(خۆشی و ترشی ــ ٦)

داری ئازادی بە خوێن ئاو نــەدرێ قەت بەر ناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبــەد سەر ٠٠٠ ناگرێ

(بێکەس)

تۆباڵی ئەمەشی ئەخستە ســەر تاریکیی ژوورەکە و خراپی دەزووەکە ٠

(پاڵتۆ ــ ٢٠)

مۆمێ نەبوو لە شەوگاری تەنیاییی‌یا ، بیسووتێنم
لــە نـــاو ڕەشی و بێدەنگیـــا خـــۆم ببینـــم

(هەڵبژاردەی ڕۆژی کوردستان ــ ٥٣)

٢ ــ ــ ە ٠ وەك :

کەم ئەجوولێی سەوزە و میوەهات ناخۆی

(ڕاوە بەران ــ ٢٠)

ئەوانە نەك نەبوون بە بەگث ، بەڵکو بوون بە بەندەی گوێ لە مستی پاشا ٠

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٢٢)

خراپــە هیچ مەکە تا بــەد نەبینی
مەچێنە تۆی بەدی تــا دڕك نەبینی

(خۆشی و ترشی)

٣ ــ ــ ەتی • وەك :

ئازایەتی بێ هەمتای گەنجێك كە لە هەڕەتی لاویدا ژیانی خۆی بەخت كرد •

(فریشتەكانی سەرزەمین ــ ١٧)

٤ــ ــایی • وەك :

كە شەماڵ ئێوارە تاریكایی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا ، چاوەكانی دەكەوتنە نەرمە تروكان •

(بوار ــ ٥٦)

هەتاوەكوو بە تەواوی لە ووشكایی نزیك بووەوە •

(فریشتەكانی سەرزەمین ١٠)

٥ــ ــ ێتی • وەك :

من لە ڕەشێتی ئەمڕۆم ناترسم ، چونكە خاك و خۆڵی ڕەش جوانترین و نایابترین گوڵزاریتێدا دەڕوێ •

پیرێ كە ڕۆژانی گــەنجێتی خۆی وەبیردێتەوە هێدی هێدی سەربردەیەكی كۆنینە دەگێڕێتەوە •

( ڕۆشنبیری نوێ ــ ٦٣/٤٠)

٧ــ ــ ینە • وەك :

ئێمە نامانەوێ بەشداری لە ڕووشێواندن و شكاندنی كاری ئەدەبیدا بكەین و لە پێناوی ڕەشێنەی چاوی هەندێ كەس •

( ڕۆشنبیری نوێ ــ ٥٨/٩٩ )

٨ـ ـ ه لان • وەك :

شوێنێكی سەوزەڵان و بەرزو بە دیمەن خۆشبووە •

( دوو چامەكەی نالی )

٩ـ ـ ك • وەك :

سەبەتەكەی سەری پڕ لە ئەستورك بوو •

( هاوكاری ـ ١٨٧ )

١٠ـ ـ كە • وەك :

چاوی ڕەشكەوپێشكەی ئەكرد •

( ڕاوەبەران ـ١٦ )

١١ـ ـانە • وەك :

بە پێویستی‌یەكی ژیانی ئادەمیزادی ئەزانن بۆ پاكانە كردن
بۆ لایەنە دژ بە یەكەكان •

( بەیان ـ ٨/٣٧ )

١٢ـ ـ ین • وەك :

بۆ ڕوومەت و بەرگەردنە نەرمینەكەی •• ناو دەروونی •

( هەڵبژاردەی ڕۆژی كوردستان ـ ٦٥ )

١٣ـ ـ ندە • وەك :

لە دەستی گورگ و دڕندەی ستەمكار
بیانپارێزە ڕۆژ و شەو ببە یار

(خۆشی و ترشی ـ ٩)

١٤ ــ ـەمەنی • وەك :

ساردەمەنی‌یەکەی بێ خەوش و پاك و خاوێنە •

١٥ــ ـآن • وەك :

ئەو میللەتانەی لە جێگای نەرمان و گەرمێن و بەرێژە و پڕ پیت و بەرەکەت •

(مەم و زین ــ ب)

٣ ــ ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر کاری سادە و دەیکەنە نێوی داڕێژراو :

١ ــ بناخەی کردار+پاشگری ــآر • وەك :

لە وتارێکدا ، کە بەتایبەتی لەســەر ــ کۆڕی زانیار ـ م نووسیوە •

(ئاسۆی زانکۆیی ــ ٤)

خۆی دزیەوە کەوتە باخ و گوڵزار •
بی تایەن و سەرسپی و پەرستار •

(مەم و زین ــ ٦٧)

جولەکە ســەهیۆنی‌یەکان کوشتارێکی زۆریان لــە عەرەبی فەلەستین کرد •

(پەروەردە ــ ١١٩)

٢ ــ ڕەگی کردار+پاشگری ـەر • وەك :

هێندێ نووسەری لاوی ترمان هەر هەمان ڕێگای لەوەبەریان تیا گرتە بەر •

(هاوکاری ــ ٣٦٦)

چەشنە خوێنەر و گوێگری شەیدای بێ بزاخینن •
(هاوکاری ـ ٣٣٦)

٣ ـ ڕەگی کردار+پاشگری ـیار • وەك :
وەك دەڵێم بۆ
پرسیارێکە کەس تێی ناگا بەس من و تۆ

٤ ـ بناخەی کردار+پاشگری ـمان • وەك :
ئاسکە جوانەکەی هەردەی نیشتمان
عاشق و شەیدا ، وێڵ و سەرگەردان
(لەتیف بەرزنجی)

٥ ـ ڕەگی کردار + پاشگری ـ ە • وەك :
لەرزین و ناڵە هەر بەردەوام ئەبێت •
(فریشتەکانی سەرزەمین ـ ١٣)

٦ ـ بناخەی کردار+پاشگری ـە • وەك :
لـە دڵ مەگـــرە دێوانەیــە
کار و کـــردەی شــێتانەیە
(گۆڤاری هەولێر)

٧ ـ ڕەگی کردار+پاشگری ـەك • وەك :
کوتەك دەزانێ قۆناخ لە کوێیە •
(پەندی کوردی)

٨ ــ ڕەگی کردار+پاشگری ــکە ٠ وەك :

بەڵام دوو دڵم ٠٠ نازانم ،
بەسەر کام کێڵگەی تینوودا ، تێر ٠٠٠ ببارم ؟

(شەونامەی شاعیرێکی تینوو ــ ٩٢)

٩ ــ ڕەگی کردار+پاشگری ــآك ٠ وەك :

چی دڵ دەیــەوێ ببێتــە خــۆراك
چی لەش دەیــەوێ ببێتە پۆشــاك

(مەم و زین ــ٤)

١٠ــ ڕەگی کردار+پاشگری ــکە ٠ وەك :

باڵی داوە لە تەك باڵندەکانی تر و کەوتە فڕکە ٠

(بەیان ــ٤٥/٤٦)

١١ــ ڕەگی کردار+پاشگری ــندە ٠ وەك :

تینوێتی خاك و باڵندە و فڕندە ٠٠٠

(هاوکاری ــ ٣٩٣)

١٢ــ بناخەی کردار+پاشگری ــەمەنی ٠ وەك :

ئــەلف و بێیــەکی کــوردیی لاتینی دەرکــرد بــە نێــوی خواستەمەنی ٠

سووتەمەنی بلێسەی ڕێی ڕوونــاککەرەوەی ژیانی تار و سەختی بوو ٠

(هاوکاری ، ژمارەی تایبەتی)

١٣ـ بناخەی کردار + پاشگری ـەوە ٠ وەك :

پێشڕەو کردەوەکی نالەبار بـکات مەردمی ڕەمەکی خراپتر دەکەن ٠

(پەندی کوردی ـ ١٦)

١٤ـ بناخەی کردار + پاشگری ـ ەوار ٠ وەك :

ئێستا خوێنـدەوار بە هـۆی چەند گـرێ و گۆلێـکەوە بە چیرۆکەکەوە بەستراوە

(بوار ـ ٥٣)

هێندێ پێشگر هەن ، کە دەچنە سەر ڕەگ وەیا بناخەی کار و ناوی داڕێژراوی لێ پێك دێنن ، بۆ وێنە :

پێ ٠ وەك :

تۆزی ڕەشەبا چاوی کوێرکردووین
شەو لە سەربانان پێخەفی بردووین

(پیرەمێرد ـ ٦٠)

لە هەموو کاتێکا پێویستم بە یاریدەدان و هاوکاری تۆیـە (لالۆکەریم)

٢ ـ بەر ، وەك :

چێشتی خۆش لە بەرکوڵی دیارە٠

سەرنج : لەم باسانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ ڕوون بۆوە ، کە زمـانی کوردی لەو پاشگرانەدا دەوڵەمەندە ، کـە ناوی داڕێژراوی بە خۆیەوە لێ دادەڕێژرێ بـەڵام پێشگری زۆر کەمە ٠

دووەم ناوی لێکدراوە :

ئــەو ناوەیە کە دوو وشەی لێکدراو یان زیاتری تێدابێت ٠
گوڵبەهار ، شەکرەسێو ، گرمەگرم ٠٠٠
ناوی لێکدراو لە مانەی خوارەوە پێك دێت :

١ ـ دوو ناوی سادە :

لە قوتابخانەیەکی سەرەتاییدا وانەم ئەوتەوە
( لە سەر زەردەخەنەیەك )

هەستو نەستی گوڵبەهار ئێجگار سەر کێشانەبوو
(ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ٥٨)

ئەوێستا پێت نیشاندەم ماڵی تیتل
ئەتۆش داوێمە ناو چاڵاوێ بیبل
(خۆشی و ترشی ـ ١٤)

هەوری سۆر بانگ دەکاتە جوتیاران لێك بدەن گاسن و باران
(پەندی کوردی)

٢ ـ دوو ناوی سادە بە یارمەتی پەکێك لەم مۆرفێمە پێوەندی ٠
(ئینتەرفیکس)انە :

أ )ـ و ٠ وەك :

ئا لەو کاتەدا ئەکاکی دەمو چاوی سوور هەڵگەڕا
(پاڵتۆ ـ ٤٠)

چیا بوو بە گڕ ٠ بەرد بوو بە گڕ ، خاك و خۆڵ بوو بە گڕ
(ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ١٣٩)

ب )ـ ە ـ وەك :

تو خوا دڵم مەشکێنە بابزانم رووت وابینە
ڕووت یا گوڵی هەنارە یا شەکرەسێوی خاوە

(وەفایی)

بووکە شووشەی باوەشم تاکە هاوڕێم
بە سرتە سرت باسێ نەمابوو بۆی نەڵێم

(ك ٠ موکریانی)

لە بەردەم گوڵە باخە هەڵچوەکەدا وەستا

(بوار ـ ٣)

ج) ـ بە ـ وەك :

ئای کە مرۆڤێکی سەربەکیچەڵ بوو :

٣ ـ بە دووپات کردنەوەی ناوێك بە یارمەتی ئینتەرفیکسی ( ە ) وەك :

دەنگە دەنگێ و گرمە گرم ئەهات

(ژانی گەل ـ ١٦)

٤ ـ ئاوەڵناوێکی سادە + نێوێکی سادە :

ئەی خوایە بە نالە نالی بولبول
خوایە بە خوناوی ناوی سوورگوڵ

(مەم و زین ـ ١٠٤)

دۆڵێکی قووڵی هەزار بە هەزار وەك رەشماری کشابوو
(راوە بەران ـ ٢٥)

٥ ـ ناوێکی سادە و ئاوەڵناوێك بە یارمەتی ئینتەرفیکسی ( ە )
به هەورازی کێلەشینیدا هەڵگەڕام
(چیرۆکی کەڵەباب ـ ١٣)

٦ ـ ئاوەڵناوێکی سادە+نێوێکی سادە بە یارمەتی ئینتەرفیکسی ( ە ) وەك :
ڕەشەبای ئەمساڵ لێرە دوو ڕەنگە
هێشتا نەمدیوە من بای بەم ڕەنگە
(پیرەمێرد ـ ٤٧)

لە نێو سەوزە گیادا من و ئەو بووین من و ئەو بە تەنیا
(هاوکاری)

٧ ـ ناوێکی سادە + رەگی کار ٠ وەك :
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە
( بێکەس )

لە دەستم دێ
کاتژمێری کامەرانیت بوەستێنم
(شەونامەی شاعیرێکی تینوو)

دانانی دارفرۆشەکان بە چاودێری دارستانەکان
(هاوکاری ـ ٣٦١)

ماسیگرەکە وەك بروسکە گەیشتە سەری ٠
(ماسی‌یە ڕەشە بچکۆلەکە ـ ٢٢)

٨ ـ دوو ڕەگی کار بە یارمەتی ئینتەرفیکسی ( و ) • وەك :

بەد بەختم نەکەی نەمکەی دەربەدەر
لە خۆت هیچ نەدەی تانوت و حونەر
ڕاوەستە لەسەر گفتوگۆی خەتەر

(بارام و گوڵئەندام ــ ٥٧)

بێ ئەوەی هاتووچۆی پزیشکەکان یان بوونی نەخۆشەکانی تر بیخلافێنن

(فریشتەکانی سەرزەمین ــ ٦)

٩ ــ ناوێکی سادە + ووشەیەکی ناسەربەخۆ • وەك :

بە سەری تۆ مووچەکەم هەمووی بە قەرزوقۆڵە ئەدەمەوە •

١٠ــ وشەیەکی ناسەربەخۆ + ناوێکی سادە :

سایەی نەدەکەوتە سەر گڵ و خۆڵ
وە دوای دەکەوت گژوگیا و گوڵ

(مەم و زین ــ ٩)

١١ــ ژمارە + ناوێکی سادە :

لەبەر ڕۆشنایی چل چرای ئاهەنگ و بەزمی شەوەکیدا •
(پاڵتۆ ــ ٤١)

١٢ــ ڕەگی کردار و ناوێکی سادە بە یارمـەتی ئینتەرفیکس(ە) وەك :

حەمەد ئەچێتە سەر تاشە بەردێکی کە بنی هەزار بە هەزارە•
( ڕشتەی مرواری)

## ناو لــه ڕووی واتاوه

ناو له ڕووی واتاوه سێ جۆره : ـ

یەکەم: ناو له ڕووی مەفهومەوه ، ئەم سێ بەشانەی خوارەوه دەگرێتەوه :

**باسی یەکەم :**

**أ ـ ناوی تایبەتی :**

کەسێ وه یا شتێکی دیاریکراو پیشان دەدا :

بەسه تو خوا کاڵێ گیان بەم چەشــنه خەیاڵانــه دڵی خــۆ ئازار مەده ٠

جارێ لەم دێیەدا پیاومان نی‌یه له (لالۆ کەریم) پیرتر بێ

(لالۆ کەریم ـ ٢٥)

گوڵبەها رو ئەحمەد نیازیان گرت و شانی پیری کاروانیان ماچ کرد

(ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ١٢١)

هەولێر یەکێکه له شاره ناودارەکانی کوردستانی عیراق ٠

(خوێندنەوەی کوردی ٣٠)

ئەگەر له زۆزك مژبێ ، له هەندرێن تەمه ٠

(پەندی کوردی ـ ١٦ )

لەم ڕستانەی ژووروودا ووشەی (کاڵێ، کەریم، گوڵبەهارو ئەحمەد) ناوی تایبەتین چوونکه نــاوی کەسێك بەدیار دەخەن ، وشەی ـ هەولێــر ـ کوردستان ، عیراق ، زۆزك و هەندرێنیش ناوی تایبەتین ناوی شوێنێکی دیاری کراو پیشان دەدەن ٠

**باسی دووەم :**

**ب ـ ناوی گشتی :**

ئەو ناوەیە ، کە بەو کەس و شتانە دەگوترێن کە ڕەسەنیان یەك بێ :

دڵە کوتەم نی‌یە ، دڵم
چی‌ی کیژێکی خانومانە

(تاریك وڕوون)

کچ تەشی دایێ دەڕێسێت ، کوڕ کڤانی بابی دژەنیت ٠

(پەندی کوردی ٦٦)

مرۆڤ هیچی لە تارماییەکە بەدی نەئەکرد ٠

(چیرۆکەکانی مەم ـ ٥)

کە لە شار نزیك بووەوە شنەی هیوایەك دای لە دڵی ٠

(پێکەنینی گەدا ـ ٩١)

میوەی منە خۆشە بۆی نەماوم
کۆرپەی منە بۆتە چاوی چاوم

(مەم وزین ـ ١٠٩)

وا لێم دوورکەوتەوە من لەم‌بەر و ئەو لەوبەری ڕووبارەوە

( هاوکاری ـ ٤١٣ )

لەم ڕستانەی سەرەوەدا ـ کیژ ، کچ ، کوڕ ، مرۆڤ ، شار ، میوە ، کۆرپە و ڕووبار ـ ناوی گشتین ، چونکە بە هەموو کیژێ دەگوترێ کیژ و بەهەموو کوڕیش دەگوترێ کوڕ ٠ ٠ ٠ هتد ٠

**باسی سێیەم :**

**ج ــ ناوی کۆمەڵ :**

ئەو ناوەیە ، کە لە شێوەدا تاکە و لە نێوەرۆکدا واتای کۆ دەبەخشێت :

جووتیار زۆربەی گەلە لەبەر ئەوە پێویستە گرنگییان پێ بدرێت ٠

(١٠ چیرۆك ــ ١٥٠)

بە بادانی دوکەڵی قەنگە درێژەکانیانەوە باسێکی کۆمەڵە (مجتمع) فراوانەکەیان بکەن ٠

(پاڵتۆ ــ ١٤)

کەواتا ئەم کچە تیرە و بنەماڵەی بۆسۆ و بەدناو کردم ؟

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١١)

بۆیە لەشکرەکەی کرد بە دوو قۆڵ و ناردی بۆ سەر دیاربەکر ٠

(مێژووی نەتەوەی کورد ــ ١٩٨)

وشەی (گەل ، کۆمەڵ ، تیرە) لە ڕواڵەتدا تاکن ، بەڵام لە واتادا کۆ پێشان دەدەن ٠

دووەم : ناو لە ڕووی ڕەسەنەوە دابەش دەکرێتە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە :

**ا ــ ناوی مێینە :**

ئەو ناوەیە کە بۆ جنسی مێ بێ :

چۆن دەبێ سەربەست گەلێ ژێر دەست کە کچ دابەستە بێ
بەس نەبێ ئەو کۆیلەتی و ئەو کچ لە ژوور دابەستنە

(هێمن)

کە جلوە حوسنی بە عشق ئەکا پەرواز
ژن کەفوت ئەخاتە خەیاڵی ڕقص ئەنگیز

(گۆران)

کیژ دارگیــزە هەرچی بەکنیدا تێپــەڕێ پــەلاری خۆی تێ دەگرێ ٠

(پەندی کوردی ــ ٦٨)

سوڵتان تەماعی لە شیری کرد ، چێڵیش هیشکی کرد ٠

(پەندی کوردی ــ٥٨)

لە مریشك بەولاوە حەز لە هیچی تر ناکات ٠

(١٠ چیرۆك ــ ٩٢)

**ب ــ ناوی نێرینە :**

ئەو ناوەیە کە بۆ جنسی نێر بێ ، وەك :
(پیاو ، زەردەشت ، ئەسپ ، کەڵەباب ، کەڵەشێر) ٠
خوێندەواریشمان بە بیانوو لە پیاو
دوو دەیی ئەوێ یەك قبووڵ تەواو

(ا ٠ هەردی)

بە بیروڕای من زەردەشت جۆتکارێــکی خەڵکی ناوچەی ماد بووە ٠

هەموویان سەروبەری کاروبــاری خۆیان کرد ئەوی ئەسپی هەبوو ، ئەسپ ٠٠٠

(چیرۆکی کەڵەباب ــ ٤)

کەڵەبابەکە دەنك دەنك خوویێیەکەی خڕ دەکردەوە ۰

(چیرۆکی کەڵەباب ــ ١١)

کاتێکی کەڵەشێری نیوە شەوێ بانگی دا گوڵبەهار هێندەی گوڵۆڵەیەکی لێ بەسەر هاتبوو ۰

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٧٧)

**ج ــ ناوی دوولایەن :**

ئەو ناوەیە ، کە بۆ نێر و مێ بەکار دێت ، وەك :

گا دەکا ، جاشك و گۆلك دەخوا ۰

(پەندی کوردی)

لە بارەی گیسك ، لە خۆشی قەساب ۰

(پەندی کوردی ــ ٧٢)

هەرامەی سەرکێش سەری خۆی بڵند کرد وەکو ووشترێکی شێت پێیەکانی گەزێك لەسەر زەوی بەرز کردەوە ۰

(چیرۆکی کەڵەباب ــ ٥)

دوژمن بکە بە دۆست ، دۆست مەکە بە دوژمن ۰

(پەندی کوردی ــ ٣)

نەخۆش زۆر جار ، کە ئەگاتە لای پزیشك هەست بە چاکبوونەوە ئەکا ۰

(ڕاوه بەران ــ ١٦)

شێر لە بێشە دەرپەڕێ چ مێ ، چ نێر •

(پەندی كوردی)

**د ــ ناوی بێلایەن :**

ئەو ناوەیە ، كە ڕەسەنی نێر و مێی نییە ، وەك :
(ئاو ، بەرد ، لۆكە ، چیا ••• هتد) •

منیش دەم و پلم خواتەوە ئەڵێی ئاو لایداوم •

ئیلتیماسی تاهیری بێچارە قەت سودی نییە
تۆ كە دایم شەڕفرۆش بی ، بەو دڵەی وەك بەردەوە

(تاهیر بەگ)

بۆ ناوئاخنەكەش (ئەكاكی ئەكا كیفیج) بە لۆكە ڕازی بوو•

(پاڵتۆ ــ ٣٥)

چیا بە هەموو ڕك و تووڕەییەكیەوە هەنگاوی هەرابەرینی هەڵدێناوە •

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١٣)

سەر لە بەیانیەك ڕێویەكی فێڵباز زەمیلە ماسیەكی لە تەك خۆیا هەڵگرتبوو

هاوكاری ــ (٣٩٤)

**نێرو مێ :**

ڕەسەنی نێر و مێ لەم سێ دۆخانەی خوارەوەدا جیادەكرێنەوە :

### أ ـ له دۆخی خستنەسەردا :

له شێوەی کرمانجی ژووروودا ئـامرازی خستنەسەر (١) بە نیشانەی تاکی مێیینە دەژمێررێت ، له کاتێکدا ( مضاف ) دوا پیتی بێ دەنگ بێ وە نیشانەی نەناسیاری ( ـ ەك )ی لەگەڵ نەبێت ، وەك :

بخەباتا ملێ من          بڤیانا دلێ من ٠
مالا من نە ڤالایە          ئەڤرۆ رۆژا پالایە

(ڕۆشنبیریێ نوێ/٨٢/٥٤/٥٨)

لـه هێندێ زارۆچکـەی کرمـانجی خواروو‌شدا ئـامرازی خستنە سەری تاکی مێ(١) لەگەڵ ناوی مێ دێ ، بۆ وێنە :
ژنا شەرمن بشارەکی زەلامی شەرمن بچەرمەکی

( پەندی کوردی )

له شێوەی کرمانجی ژوورووودا گەر دوا پیتی مضاف پیتێکی دەنگدار بوو ٠
نیوە دەنگداری          ـ /ـ ی لـه نێوان هەردوو دەنگداردا پەیدا دەبێ بۆ وێنە :

دایا من دەخەبتە ٠
له شێوەی کـرمانجی ژووروودا لـەگەڵ ناوی تـاکی مێی نەناسیار ئامرازی خستنەسەری( ـە )بەکار دێت ، بۆ وێنە :
نارین کچەکە ژیر و ژێهاتیە ٠

(ئەلف و بێ‌یا کوردی ـ ٤٦ )(١)
ئامرازی خستنەسەر ـ ێ بە نیشانەی تاکی نێرینە دەژمێردرێت ،

لــه کاتێکدا ( مضاف )دواپیتی بێ دەنــگ بێ و نیشانــەی نەناسیاری ( ەك )ەی پێوە نەلکابێت ، وەك :

میڤانێ بێ وەخت کیسێ خوە دخوا

( پەندی کوردی ـ ٢٠١ )

هەرچەند ژهێستری مەمێ ژار ٠

شین بوون لە ڕەخی شەتی سپیندار

( مەم و زین ـ ١٠٦ )

گــەر دواپیتی ( مضاف ) پیتێکی دەنگــدار بوو ،نیــوە دەنگدار ـ /ی/ لــە نێوان هــەردوو دەنگداردا پەیدا دەبێ بۆ وێنە :

برایێ تە جەم من رونیشت ٠

ئامرازی خستنەسەر (ـ ی ) نیشانەی تاکی نێرینەیە لەگەڵ ناوی نەناسیار وەك:

شاعرێ مە زانایەکی مازن بوو ٠

(چیا ، ژ ـ ساڵی ـ ١ ، ل ـ٥٤)

شەڤەکێ جەحیلەکی گوندی هاتە مالا وێ ٠

(چیرۆکێت کرمانجی ـ٩ )

**ب ـ لە دۆخی بانگکردندا :**

ڕەسەنی نێرومێ لە زمانی کوردیدا لەدۆخی بانگکردنیشدا بە دیار دەکــەوێ ٠ لە کرمانجی خــوارووەدا لەگەڵ نــاوی ڕەسەنی نێر نیشانــەی (ە) دێت وە لەکرمانجی ژووروودا

نیشانەی (ۆ)دێت :

کورە خـــوا سەلامەتت کـــا هـــەمووی دەستێك سوێندە بۆی ئەخۆیت و هیچی تر

(لالۆ کەریم ــ ٢٩)

بانگ‌کر ، گۆت : (لاوۆ ، حەشاشۆ ، شەرابخۆرۆ ، تـۆی دینی : ب

(مەمێ ئالان ــ ٦٦)

ناوی ڕەسەنی مێ لە هەردوو شێوەکەی زمانی کوردیدا لـــە دۆخی بانگ‌کردندا نیشانەی (ــێ ) پێوە دەلکێت :

کچێ تـــۆ بـــووی خۆشـــەویستیت لە ناو دڵی منـــا خنکـــان

(نیگای حەزێکی ئاوارە ــ ٤١)

**ج ــ دۆخی ناڕاستەوخۆ ( تیان )**

نـــاوی ڕەسەنی مێ لـــە کرمانجی ژووروودا وە لـــە هێندێ ناوچەی شێوەی‌کرمانجی خوارووودا لە دۆخی ناڕاستەوخۆدا کۆتایی بە نیشانەی ( ــێ) دێت :

بحەلیانا وێ بەفرێ ئەردێ کوردستانێ کەسك دبیت

(نوسەری کورد ــ ١١)

لە سەر ئاوی ڕەواندزێ پردێکی دروست کرد ٠

(هاوکاری ــ ٢١٠)

نێوی ڕەسەنی نێر لـــە کرمانجی ژووروودا وە لـــە هێندێ ناوچەی کرمانجی خوارووودا کۆتایی بە نیشانەی (ی) دێت :

دیمەنی شاری لە دووڕا دیارە

(بەیان)

کلیدادەر ــ ی گەلەك مەزنە

(هاوکاری)

**٣ ـ ناو لە ڕووی سەربەخۆیی هەبوونەوە ٠**

ناو لە ڕووی سەربەخۆیی هەبوونەوە دوو بەشە :

**باسی چوارەم :**

أ ــ ناوی مادی (بەرجەستە) : ئەو شتەیە کە بەر ئەندامانی هەست دەکەوێت :

ستێر و مانگ و ڕۆژ و ، با و زریان ، بەفر و باران ، گوڵ و گولیلکان لە گەڵ خۆی هەڵدەگرت ٠

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١٤)

زێڕ و پول و ماڵ بێ من بێ فامە
خەزینە و گەنجم چاوی گوڵندامە

(بارام و گوڵندام ــ ١٠٦)

التماسی کوژتنم لێ کرد گوتی نازانی تۆ
من چەپەڵ ناکەم لە خوێنی هەر سەگێدا خەنجەرم

(م ٠ کوردی ــ ٢٤) ب

**باسی پێنجەم**

**ب ــ ناوی مەعنا (گوزارە/ئەبستراکت)**

ناوی شتێکە کە بوونی سەربەخۆی نی‌یە ، بەڵکــو لە بیر و خەیاڵدا پەیدا دەبێ :

هەر کەسێکی تر بایە ئێستا وە هۆشم دەهێنایەوە

(بۆ پێکەنین ــ ٦٧)

هەتا گەیشتمە ناو گۆڕستانەکە سێ و دووی ترس شانمی بە تەواوی قورس کردبوو

(١٠ چیرۆك ــ ل ٣)

چاکەی ئاشکرا ، خێری تێ نەما •

(پەندی کوردی ــ ٣٨)

خراپە لەگـەڵ بێتاوانان بکەین خۆتی سـزای دەکێشـیت

(پەندی کوردی ــ ٣٨)

## ناوی گوزارە لە بنەڕەتدا دوو جۆری هەیە

### ١ ــ ناوی گوزارەی بنجی :

ئـەو ناوەیە ، کە لـە بنچینەدا بۆ گـوزارە واتای گـوزارە ببەخشێت :

وەکو ئێوە چاوگەی خەم و ژان و ئێش نیم

(پرچی ئەو کچە ــ ٣٠)

تۆ بڕۆیت من لە ترسا شێت ئەبم

(ژانی گەل ــ ١٠)

### ٢ ــ ناوی دروست کراو :

ئەو ناوانـە دەگرێتەوە کە لـە وشەیەکی دیکەوە بە هـۆی پاشگرەوە دادەڕێژرێ وە یا بە هۆی داڕشتنێکی تایبەتی‌یەوە ناوی دروست‌کراو لە ناوەوە :

له ژیانیا گەلێ جار موچڕڕکی پیا ئەهات ، کە دووری مرۆڤی
ئەدی لە مانای مرۆڤایەتیەوە

(پاڵتۆ ـ ٨)

ناوی دروستکراو لە ئاوەڵناوەوە :
جوانیی داگیرکرد بە یەك پاروو نان
گولاڵەی گەشی شانازی ... وەران

(کامەران)

## باسی حەوتەم

## نیشانەی ناسیاری

نیشانەی ناسیاوی : ئەو نیشانەیەیە ، کە دەچێتە سەر نێو و دەیکا بە ناسراو لە زمانی کوردیدا دوو نیشانەی ناسیاری هەن : ( ەکە ) و ( ە ) .

گەر نێو کۆتایی بە پیتی نەبزوێن بێ ، ئەوە بۆ ناساندنی نیشانەی ( ەکە )ی پێوە دەلکێت :

ئەم ژنە بە پێویستی زانی ناوێکی پیرۆز لە منالەکەی بنێ
( پاڵتۆ ـ ٣ )

شەوبۆی سەری سونبولی زوڵفت لە سەر دام
ئیستەش سەرەکەم مەستە لە بەر نەشئەی شەوبۆ

(نالی)

ئەسپەکە سەربەخۆ وە نێو شاری کەوت
(ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ٩٣)

لە نێو ئەم هەموو تابلۆیانەدا هۆڵەکەدا تابلۆیەکی وای سەرنج راکێشام ، کە ماوەیەك بەرامبەری بوەستم

(ئاسۆی زانکۆیی ــ ٤)

ئەگەر نێو کۆتایی بەپیتە دەنگدار هاتبێ ، ئەوا بــەم جۆرە دەبێ :

١ ــ ئەگەر نێو کۆتایی بە پیتە دەنگداری (ــە) بێ ، ئەوسا یەکێك لەو دوو پیتــە دەنگــدارە ، یــانی (ــە)ی کۆتــایی وشەکە وەیا (ــە)ی ســەرەتای نیشــانەی ناسیاری ( ــ ە کــە ) تێ دەچێ :

دیسان لێرەدا بە ووردی لە مەسەلەکە نزیك بووەتەوە ٠

(نووسەری نوێ ــ ٢)

٢ ــ ئەگەر نێو کۆتایی بە پیتە دەنگداری (ــ آ ، و) بێت ، ئەوە سەرەتای (ەکە) تێ دەچێ ، یا نێوە دەنگداری (ــی ، ) لە نێوان ووشە و نیشانەکە پەیدا دەبێت ٠ وەك :

ئافرەتەکە لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو ٠

(پاڵتۆ ــ ٣)

بۆیە حەز دەکەم تابلۆکانم خۆشــەویستەکەم ، پەرستگاکەم بنوێنن ٠

(ئاسۆی زانکۆیی ــ ٤)

وێنەیەکت بۆ بنەخشێنم لــە تابلۆیەکەی مۆنالیزا جوانتر و نێودار تربێ ٠

٣ ــ نێوی کۆتایی هاتوو بە پیتە دەنگداری (ــوو) کە بە هــۆی نیشانەی ناسیاری (ــ ەکە) دەبێتە ناسیار ئەوە (ــوو) کەمێ کورتتر تەلەفوز دەکرێ وە نیــوە دەنگداری (ــو) لە نێوان

وشەکە و نیشانەکەدا پەیدا دەبێ ، بۆ وێنە :

ئۆباڵی ئەمەشی ئەخستە ســەر تاریکیی ژوورەکە و خراپی دەزووەکە •

(پاڵتۆ ــ ٢٠)

٤ ــ ئەگەر نێو کۆتایی بە پیتە دەنگداری (ێ، ی) هاتبێ لە نێوان نیشانەکەدا نیوە دەنگداری (      ــ ی) پەیدا دەبێ •

لەوانەیە ئێستە باپیرە لەبــەر دەرگا ڕاوەستابێ وە سەیری پەنجەرە سوورە بریسکەدارەکانی کەنیسەی دێیەکە بکات •

(ئاسۆی زانکۆیی ــ ٤)

کچە هەرکــە چــاوی بــە تارماییــەکە کەوت دەســبەجێ شاگەشکە بوو •

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٥٢)

لالۆ تاقە کەسێك بوو لە دێیەکەدا خزم و کەس و کاری شك نەئەبرد •

(لالۆ کەریم ــ ١٢)

٥ ــ نێو چ داڕێــژراو چ لێکدراو بێ ، ئەوە نیشــانەی ناسیاری (ەکە) هەر بە کۆتایی ووشەکەوە دەلکێ ، وەك :

دوو سەربازەکە چەکدار بــوون و ئەیانتوانی بە زۆر بێنە ژوورەوە •

(فریشتەکانی سەرزەمین ــ١٩)

دڵدارەکەی من بۆیە هەژارە
بۆیە هەمیشە برسی و بێکارە

(پرچی ئەو کچە ــ ٤٤)

لە نێو خەڵکی وولاتەکەی خۆیدا بیروباوەڕەکەی خۆی بڵاو کردۆتەوە ·

٦ ــ لە ووشەی لێکدراوی دیارخەر (ئەتریبوتیف)ی خستنەسەردا نیشانەی ناسیاری (ــەکە) بە وشەی دووەمەوە دەلکێ :

ژنە دڵسۆزەکەی لەپە ساوارێکی گەلێك بە تامی بۆ لێنابوو·
(کلافەیەك ژانی تووڕە ــ ٦٦)

مەگەر هەر دۆستە دڵخوازەکەی زمانی کوڕڕێنیم لە پێشەنگی سەرقافلەکەی جوانتر بوایە ·
(هەمیشە بەهار ــ ٦٠)

کاربەدەستانی خەستەخانەکە دڵخۆشی سەربازەکەیان دایەوە ·
(فریشتەکانی سەرزەمین ــ ٦)

پیاوە پیرەکە ڕووی بە لای ئەوانەی چواردەوریا وەرچەرخان ·
(ڕەنجی کرێکار ژمارە ١ ــ ٢٩)

**نیشانەی ناسیاری (ــ ە) :**

نیشانەی ناسیاری (ــ ە) وەکو نیشانەی (ــەکە)ەوە دەلکێ و دەیکا بە نێوی ناسراو :

کوڕە بە کزیەکەوە وەرامی دایەوە ·
(لالۆ کەریم ــ ٤٦)

کچە خۆی لەبەر ئەو ئەوینە سەختە پێ ڕانەگیرا ·
(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١٣٩)

## باسی هەشــــــتەم

### نیشانەی نەناسیاری :

ئەو نیشانەیەیە ، کە دەچێتە سەر (ناو) و دەیکا بە ناوێکی نەناسراو •

نیشانــەکانی نەناسیاری (ــ یك ، ەك) لە زمــانی کوردیدا تاکایەتی پێشان دەدەن • ب

لە شێوەی کرمانجی خواروودا (ــێك) نیشانەی نەناسیارییە ،کە لەگەڵ ئــەو ناوانە بەکار دێت ، کــە کۆتاییان بــە پیتێکی بێدەنگ دێت : ب

نەجاتی دەبێ لە دەستی ئەوانە ، دەچنە بن بەردێك •
(شێخ فەرخ و خاتو ئەستێ ــ ٥١)

بە چ جــۆرە ئەشکەنجە و ئازارێــك داخی دڵی خۆیــان پێ بڕێژێ •
(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١٣٣)

کە دڕکی پەنجەی باوکێکی بێ بەزەیی ئەیخورێنێ •
(هەڵبژاردەی ڕۆژی کوردستان ــ٦٧)

نازانــم چ بەهرەیــەکی خــوایی و چ هێزێــکی نادیــار و تەلیسماویتان پێیە •
(پیاوە بچکۆلەکە ــ ٥)

زانایانی فۆلکلۆر هەر یەکە بــە جۆرێك لە پەندی پێشینان دواوە •
(ئاسۆی زانکۆی ــ ٨٢/٤)

نیشانەی نەناسیاری لەگەڵ ئەو ناوانەی ، کە کۆتایی‌یان بە

پیتێکی دەنگدار هاتووە لە شێوەی (ـ یەك)دا دەبێ :

تۆ تەماشا تەماشـــا چیایەکی وا گـــەورە و زەلام لــە کونی بلوێرێکی هێندە تەسك و باریکەوە دەردەپەڕێنێ •

(ئەفسانەی چیایئاگری ـ ١٣ )

جا لەبەر دڵی ئەو (لاپەڕڕەیەکی تری بەختنامەی ئەولیاکان کرانەوەیە •
ب ب

(پاڵتۆ ٤ )

ئەوەتا ئەمیش بـــووە خاوەن سەبەتەیـــەك و عارەبانەیەکی دەست •

(دەستی ئوخە ـ ٢٠ )

بە جێیەکی چوڵدا هاتن ، هەتا حەوت ڕۆژ هیچ ئاوەدانیان نەدیت •

(بارام و گوڵئەندام ـ ٤٨)

ئەگەر نەمـــکەن بە سەرۆکی وەزیـــران خۆم فـــڕێ ئەدەم ، ئەوسا هیچ مەترسییەك بۆ من نابێ •

(ڕەنجی کرێکار ـ ١/٣١)

بلوێری پشوویەك کڕبوو •

(ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ١٤)

بە شەویش خۆی لە ساقۆیەکی گەورە لوول دەدا •

(ئاسۆی زانکۆیی ـ ٥٤/٧٨)

مینا وەك کێچ ڕاپەڕی جامە دۆیەکی باشی بۆ هێنا •

(لەسەر زەردەخەنەیەك ــ ٢٠)

نیشانەی نەناسیاری (ــێك) لە هێندێ شێوەی کرمانجی خوارووودا لە شێوەی (ــێ) بەکار دێت ، کە لەوانەیە کورت کراوەی (ــ ێك) بێت :

پۆلێ باڵندەی سپی لە دەرکەی دوکانەوە دەفڕین •

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٧٩)

بەڵێ با گەردەلولێ بێ
ئەوی بۆنێکی تۆی لێ بێ

(ڕازی تەنیایی)

هەر باڵندەێ بە سەر ماڵمانا تێپەڕێ
نامەێ لەو بە دیاری بۆ من هەڵگرێ

(ڕۆشنبیری نوێ)

لە کرمانجی ژووروودا نیشانەی نەناسیاری (ــەك)ە، وەك:
ئەگەر من کوڕەك هەبێت ئەز دێ ناڤێ وی کەمە عەلۆ •

(چیا ــ ٥٦)

وەختێ ئەوی دیت لاوك گشك هاتن ب دەنگەکی بلند گۆت :
(نەنێ ــ٦٢)

ئەز ژی سەر کەڤرەکی رۆنشتبووم •

(دەستێ دێ ــ ٧٨)

چارەکێ ــ مریەم خان ــ برەخ کاروانەکی کەت حەتا گەهشتە زاخۆ •

(هاوكارى ـ ٣٩١)

نيشانەی نەناسـياری لە كرمـانجی ژووروودا لەگـەڵ ئەو ناوانەی، كەبە پیتێكی دەنگدار كۆتایی‌یان دێ لە شێوەی (ـیەك) دەبێ :

نێری‌یەکێ چار ساڵ کوشت ٠

(چیرۆکیت کرمانجی ـ ١٦ )

نیشانەی نەناسـیاری (ـەك) لـە هێنـدێ بەشی کرمـانجی خواروشدا لە بریتی (ـێك) بۆ نەناساندنی نێوان بەکاردێت :

تا باراشەکی لەگەڵ نەخۆی نایناسی ٠

(پەندی کوردی ـ ٣٣ )

تەیرەك لە ڕەوەی خۆی دابڕڕێ خوراوە ٠

(پەندی کوردی ـ ٣٤ )

دیاری قەسپەکی تێهێنانەوەی هەسپەکی (٠٠٠٠) ٠

(پەندی کوردی ـ ٤٩ )

## باسی نۆیـــەم

### نیشانەی کۆ :

نیشانەی کۆ لـە زمانی کوردیدا (ـان)ە ، کە بـە کۆتایی ناوەوە دەلکێ :

گولیلکی زەردی نێو بەفران سەریان دەرێنا بوو ٠

(ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ١١)

بۆچم دەکوژی بە گۆشەی چاوان
مەستی خەرامان مراوی شەتاوان

(بارام و گوڵئەندام)

خەلکی شەڤێت خۆ بچیرۆك و مەتەلـۆك و شعر و ستران و لاووك و حەیرانان ڤەدقەتاندن ٠

(ڕۆشنبیری نوێ ــ ٩٠ ، ل٨)

شاعیرانی کورد بەسە بەس باسی زوڵف و چاو بکەن
کەم خەیــاڵی پەرچــەم و کاکۆڵی ئاڵــۆزاو بــکەن

(ئەحمەد جاف)

یار دڵی خوێنین و چاوی پــڕ لە گریانی دەوێ
ئارێ ئارێ گوڵ لە باخان ئــاوی بارانی دەوێ

(نالی)

تەبەرابن لە من با کەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم

نیشانەی کۆ لەگەڵ ناوی کۆتایی هاتوو بە پیتی دەنگدار لە شێوەی (ــ یان)دا بێ چونکە نیــوە دەنگداری (ــی ، ) لە نێوان هەردوو دەنگداردا پەیدا دەبێ :

ئەم وشانە بە پیتی دەنگــدار ( آ ) دواییان هاتووە بۆیە لە کۆکردنەوەیاندا ئەبێ بڵێی :

بایان ، لایان ، چیایان ٠

(نووسەری نوێ ــ ٨٥)

ئەو وشانەی بــە پیتی بــزوێنی (ۆ ، ێ ، ی) کۆکرێنــەوە وەکو :

جۆ : جۆیان ، نوێ : نوێیان ، زەوی : زەوییان ٠

(نووسەری نوێ ـ ٨٥)

گەر ناو ناسراو بوو ، بە واتا نیشانەی ناسیاری (ـ ەکە)ی لەگەڵ بوو ، نیشانەی کردنە گەل (ـ آن) بە نیشانەکەوە دەلکێ و لە شێوەی (ـ ەکان)دا دەبێ :

وازیلێبێنن ئەگەر ئەیەوێ خۆی فڕێ بدات ، ئەوسا یەکێك شێتەکان کەم ئەبێتەوە •

(ڕەنجی کرێکار ـ ژ١/٣٢)

سەرەڕای ئـەوەی کە هەمـوو قاپەکانت شـکاندووە هێشتا پێشدەکەنی ؟

(بۆ پێکەنین ـ ٨٦)

لە دوورەوە کێلەکانم بەدی کرد •

(١٠ چیرۆك ـ ٣٣)

لە کرمـانجی ژووروودا نیشـانەی کـۆ (ـ آن) دەگـۆڕێ بە تایبەتی لە دۆخی خستنە سەردا ، کـە دەبێتە ـ ێت ، ـ ێن ، ـ ێد •

چاڤێت خۆ هەر ل من گەش‌کرن
روێت خۆ هەر ل من خوەش کرن

(بویکا بەهدینا ـ ٨٠)

بەهرا پتر یا فۆلکلۆرێ مە تەماشاخانە و موزەخانێت خۆمالی دڤێن •

(ڕۆشنبیری نوێ ــ ٨/٤٥)

ژنێن گوند ب بەخچا حەمودا دەست ب خەباتێ کربوون •

(خوەندنا کوردی ــ ٥)

دناڤ بەخچە و بوستانان دە ئاریکاریا هەڤاڵێن خۆکرن •

(خوەندنا کوردی ــ ٧)

ئەز حەز دکم
چیایێد خەملی ب کولیلکێد ئال
گەلییێد ب خەزال
بن گلۆزی عەورقوتێید وانە کال
و گۆلێد زەلال

(کولیلکێ چیا ــ ٦)

لە هێندێ شێوەی زمانی کوردیدا بــۆ کردنە گەل نیشانەی گەل ، یەل ، بەکاردێت :

سبەینێ یحشر المرء براگەل فرسەتە ئەمڕۆ
تەبەڕابن لە من با کەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم
ئــامرازی گەل لە ئــەردەڵان لۆڕستانێدا بــە فەیلیو لوڕو
بەختیاری شوان گــەلهوڕەوە ئــەمانەیە :(آن ،یان ،یــەل ،گــەل )باوکان برایان ،برایەل ،براگــەل ( ئــەلفو بێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی ــ ١٣٠ )

# پاری سێیـــــــەم

## جێ ناو

### جۆرەکانی جێناو

جێناو لە زمانی کوردیدا دابەش دەکرێتە سەر ئەم بەشانەی خوارەوە :

١ ــ جێناوی کەسی ٠ وەك : من ، تۆ ، ئەو (ئێمە ، ئێوە ، ئەوان ٠٠٠ هتد ٠

ومتد ٠

٢ ــ جێناوی لکاو ٠ وەك : م ،ت ،ی ،مان ،تان ،یان

٣ ــ جێناوی نیشانە ،وەك : ئـەم ،ئەمە ،ئـەمانە ،ئەڤ ،ئـەڤە ،ئەڤانە هۆو هۆوە هۆوانە ٠

٤ ــ جێناوی پرس ٠ وەك : کێ ، چ ، کا ، خۆن ٠

٥ ــ جێناوی چەندی ٠ وەك : چەند ، هێندە ، ئەوەندە ٠٠٠٠

٦ ــ جێناوی هەیی ٠ وەك : ئی ،هی ،ئێ ٠

٧ ــ جێنـاوی نادیـار ، وەك : یەکێـك ، کەسـێك ، هێندێك ، فلانکەس ، فیسار ، کابرا ٠٠٠٠

٨ ــ جێنـاوی دیـار ، وەك : هــەر ، هــەرکەس ، هەریــەك ، هەرتشت ، هەموو ، تەواو ، هەمووکەس ٠٠٠

٩ ــ جێناوی خۆیی ، وەك : خــۆم ، خــۆت ، خــۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان ٠٠٠

١٠ــ جێناوی نا (نەفی) ، وەك : هیچ ، هیچکەس ، هیچشت ٠

## باسی دووەم
## جێناوی کەسی

لە زمانی کوردیدا چەندین جۆرە جێناوی کەسی هەن •
لە شێوەی کرمانجی خوارووداا ئەم چەشنەیان هەیە ، کە لە دۆخی کارایی و دۆخی خاوەنی بەکار دێت :

( ئە ) من بۆ کەسی یەکەمی تاك •
( ئە ) تۆ بۆ کەسی دووەمی تاك •
ئەو بۆ کەسی سێیەمی تاك •
ئێمە بۆ کەسی یەکەمی کۆ •
ئێمە بۆ کەسی دووەمی کۆ •
ئەوان بۆ کەسی سێیەمی کۆ •

**ئەرکی جێناوی کەسی لە ڕستەدا :**

جێناوی کەسی بەپێی چۆنیــەتی بەکارهێنان و مەبەست لە بەکارهێنانی بۆی هەیە ببێ بە :

١ ــ بەشێك لە بەشەکانی سەرەکی ڕستە، کە (نیهاد ــ سەرکار)ە، بۆ وێنە :

من پیری کاروان ناناسم •
(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٧٧)

ئەویش بە لۆقە کۆڵانە تەنگەبەرەکەی خۆیانی بڕی •
(ژانی گەل ــ ١٤)

ئەتوو شێت بــووی ، ئەتوو شێت بووی ، ئەتوو بابــم هەر دەتکوژێ •

مەبەست لە بەکارهێنانی دابەش دەکرێنە سەر ئەم بارانەی
١ ــ جێناوە خاوەنی‌یەکان لەگەڵ ڕابووردووی کارە تێپەڕەکاندا
ماتە هزر کر ، کو تو بتنێیێ شەهرەزای
من رند سەرما کری‌یە ــ باڤێ گۆت ٠
هایا برێوێ میر ئەزین ، بوویە ژڤان تشتانە ؟
ئەم گشت رند زانن وەکی کورێ وی ڤان ئاخرییا چ ئانی
وێ سالێ پایزێ گندێ مەدا کەلخوز هاتە سازکرنێ ٠
هەر مالەکی دخوەست بوکا وان ژ ڤی گوندیبە ٠
ئەز دێ پرسیارەکێ ژ تە کەم ئەگەر تو رێی بدەیە من ٠
لە شێوەی کرمانجی خواروودا ئــەم دوو جــۆرە جێنــاوە
ــ ٠ ، آ ــ ێ
جێناوە لکاوەکانی جۆری یەکەم ئەم دەورانە دەگێڕن :
(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٦٨)
خوشکە پەروین ، ئێمە هەموو شتێك دەربارەی تۆ ئەزانین ٠
(بوومەلەرزە ــ ٤٠)
ئێوە بۆ خۆتان هەموو شتێکی لە من چاتر دەزانن ٠
(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٢)
ئەوان نامرن وان لە دڵی میللەتا ئەژین ٠
(هاوکاری ــ ١٣)
٢ ــ جێناوی کەسی لە ڕستەدا دەبێتە دیارخەر (ئەتریبوتیف) وە
بە هۆی ئامــرازی خستنە سەر (ــ ی) بە بەشــەکەی پێش
خۆیەوە دەبەسترێت :
کۆرپەی دایکی خۆشەویستی منی ئێستە و ئەوسای دێرین ٠

(هەڵبژاردەی ڕۆژی کوردستان ــ ٦٨)

هەر ئێستە پێکێك لە چاوی تۆ ئەخۆمەوە ٠

(پاڵتۆ ــ ٢٩)

تەمەنی وی تەنیا یازدە ساڵە ٠

(تعلم اللغة الكردية ــ ١٢٣)

وانەکانی ئێمە گرانن ٠

(کۆلکە زێڕینە ــ ٢٠٨)

دایکی جوامێر و جوامێریش گلەیی‌یان لێ ئەکرد ، کە بۆچی ماڵی ئەوان بە هی خۆی نازانێ ٠

کچم پێش لــە ملدانی وان ئەمن چارەیەك بــۆ گێڕانەوەی ئەسپەکە دەبینمەوە ٠

(ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٧٧)

٣ ــ جێناوی کەسی بۆی هەیە لە ڕستەدا ڕۆڵی بەرکار ببینێ ٠

لە زمانی کوردی‌دا دوو جۆرە بەرکارمان هەیە ، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ :

کەس و کاری کوژراوەکانیش ئەویان کوشتەوە ٠

(مێژووی نەتەوەی کورد ــ ٢٠٧)

ئەویش خوا هەڵناگرێ هەتا بڵێیت ئێمەی خۆش‌ئەوێ ٠

(لالۆ کەریم ــ ٣٥)

گیانــە من داوای لێبــوردن لە تۆ ئەکــەم ، چونــکە هیچ چاکەیەکم لەگەڵ تۆدا نەکردووە لە درۆ زیاتر ٠

له شێوەی کرمانجی ژووروودا جێناوە کەسییەکان بە پێی ئەو دۆخانەی کە تێیدا بەکاردێن دابەش دەکرێنە سەر ئەم دوو دۆخانە : ـ

ا ـ جێناوەکانی دۆخی کارا (حالة الفاعل) ئەم جێناوانەن :

ئەز بۆ کەسی یەکەمی تاك ٠
تۆ بۆ کەسی دووەمی تاك ٠
ئەو بۆ کەسی سێیەمی تاك ٠
ئەم بۆ کەسی یەکەمی کۆ ٠
هون بۆ کەسی دووەمی کۆ ٠
ئەوانە بۆ کەسی سێیەمی کۆ ٠

ئەم جێناوانـەی سەرەوە لەگەڵ ئەم جۆرە کارانـە بەکار دێن :

١ ـ کاری تێپەڕ لە کاتی ڕانەبوردوو بۆ وێنە :

ئەڤینی وەکی ئەز دزانم ٠٠٠ گەمیەکە لسەر بەحرا ئێش و ژان و خۆشییا دچیت ٠

(هاوکاری ـ ٣٨١)

٢ ـ کاری تێنەپەڕ لە کاتی ڕانەبوردوو ، بۆ وێنە :

ئەز ژ ئەرمەنیسـتانێ هاتمـە ، لێ هۆن چما تـەنێ دکەڤنە ئاڤێ ٠

(مۆرێ نەنێ ـ ٤٨)

ئەم ژ لایێ سەربەستی یا وانڤە دگەل ڕێڤە چونا ڤی سەردەمی بچین

( هاوکاری ــ٣٨ )

ئەز ناچم دەرێوی ناپاکێ قە ناکم ب          ب

(دەستێ دێ ــ ٦٨ )

٣ ــ کاری تێنەپەڕ لە کاتی ڕابردوودا • وەك :

سبەترێ ئەز دیسا وەعدی خۆەدا بەدلەکی مەلول چومە بەر بەحرێ •

(مۆریی نەنێ ــ ٥ )

وەختی ئەو نێزیکی مە بو، کەتە سەر چۆکا

(مۆرێ نەنێ ــ ٢٣ )

ئەم ڕابون ڕازان لێ خەوا من نەدەهات •

(مۆرێ نەنێ ــ ١٧ )

ب ــ ( جێناوەکانی دۆخی خاوەنی (حالة التملك) ئەم جێناوانەن :

| | |
|---|---|
| من | بۆ کەسی یەکەمی تاك |
| تە | بۆ کەسی دووەمی تاك |
| وی | بۆ کەسی سێیەمی تاك بۆ ڕەسەنی نێر |
| وێ | بۆ کەسی سێیەمی تاك بۆ ڕەسەنیمێ |
| مە | بۆ کەسی یەکەمی کۆ |
| وە | بۆ کەسی دووەمی کۆ |
| وان | بۆ کەسی سێیەمی کۆ |

ئەم جێناوانەی سەرەوە بە پێی چۆنیەتی بەکارهێنان و

مەبەست لە بەکارهێنانیان دابەش دەکرێنە سەر ئەم بارانەی خوارەوەدا :

١ ـ جێ‌ناوە خاوەنی‌یەکان لەگەڵ ڕابووردووی کارە تێپەڕەکاندا بەکاردێن بۆ وێنە :

ماتە هزر کر ، کو تو بنێ‌یێ شەهرەزای

(چیروکێت کرمانجی ـ ٩٩)

من رند سەرما کری‌یە ـ باڤی گۆت ٠

(دەستێ دێ ـ ٦٨)

مە مالدا هێشتن ژن خوشك و مندال ٠

(کلامێ رێ ـ ٣٣)

٢ ـ جێ‌ناوە خاوەنی‌یەکان لە دۆخی خستنە سەردا بەکاردێن ، کە بە هۆی ئامرازەکانی (ـآ ، ـ ە ، ـی ، ـ ێ ، ـ ێت ، ـ ێن، ـ ێد) خستنە سەرەوە دەخرێنە پاڵ نێوی دیارخراوەوە بۆ وێنە :

وەلاتێ مندا بەهار و شایێ مل دانە ملێ هەڤ و تەڤ هاتنە ٠

(دەستێ دێ ـ ٨٠)

مالا تە ئاڤایە ، خوە نەزارەکە بچوکی ٠

(دەستێ دێ ـ ٦٢)

هایا برێوێ مر ئەزین ، بوویە زڤان تشتانە ؟

(مەمێ ئالان ـ ١٢٨)

ئەم گشك‌رند زانن ، وەکی کورێ وی ڤان ئاخریبا چ ئانی سەری ٠

(دەستێ دێ ــ ٧١)

وێ سالێ پایزێ گوندێ مەدا کەلخوز هاتە سازکرنێ ٠

(موریی نەنی ــ ٨٦)

وسا دخوەیە کو بازارێوە ، بازارێ کێم ئاقل و دینانە ٠

(مەمێ ئالان ــ ٧٩)

هەر مالەکی دخوەست بوکا وان ژ ڤێ گوندییە ٠

(دەستێ دێ ــ ٤٤)

٣ ــ هەروەها جێناوە خاوەنییەکان دەوری بەرکار لە ڕستەدا دەگێڕن ، بۆ وێنە : ب

ڕۆژەکی پالەی گوتە وی مرۆڤی ٠

(چیرۆکێت کرمانجی ــ ٩٠)

تو ، زانی ، وەکی خەونیداتە ئاڤ نەدا من ٠

(مۆریێ نەنێ ــ ٥٥)

٤ ــ جێناوە خاوەنییەکان لەگەڵ ئامرازە پێوەندییەکان بەکار دێن ، بۆ وێنە :

چاڤێت خۆ هەر ل من گەشکرن ٠

(بویکا بەهدینا ــ ٨٠)

ئەز دێ پرسیارەکێ ژ تە کەم ئەگەر تو ڕێی بدەیە من ٠

(هاوکاری ــ ٣٨١)

ئەز ژ وە هێڤی دکم کو هوون شیرەتا من بجی بینن ٠

(مەمێ ئالان ــ ١٠٣)

**جیٚناوی لکاو :**

له شێوەی کرمانجی خواروودا ئەم دوو جۆره جیٚناوه لکاوانه هەن :

| | | |
|---|---|---|
| | ـ م | ـ مان |
| ١ ـ | ـ ت | ـ تان |
| | ـ ی | ـ یان |
| | ـ م | ـ ین |
| ٢ ـ | ـ ی | ـ ن |
| | ـ • ، آ ، ـ یٚ | |

جیٚناوه لکاوەکانی جۆری یەکەم ئەم دەورانه دەگێڕن :

**١ ـ لەگەڵ کاری تێپەڕی دەمی ڕانەبووردوودا دۆخی ناوی (بەرکاری) دەگێڕن ، وەك :**

دە / م / بینیٚ

دە / ی / بینم          ب

دە / ی / بینم

دە / مان / بینیٚ

دە / تان / بینم

دە / یان / بینم

**٢ ـ لەگەڵ کاری تێپەڕ و تێنەپەڕی دەمی ڕابووردوو و ڕانەبووردوودا دۆخی خاوەنی (تملك) دەنوێنیٚ :**

أ ــ جێناوی لكاو لەگەڵ كاری تێپەڕی دەمی ڕابووردوودا :

هاوڕێ / م خوێندی

هاوڕێ / ت خوێندی

هاوڕێ / ی خوێندی

هاوڕێ / مان خوێندی

هاوڕێ / تان خوێندی

هاوڕێ / یان خوێندی

ب ــ لەگەڵ كاری تێپەڕی دەمی ڕانەبووردوودا :

كار/م دەكەم

كار/ت دەكەم

كار/ی دەكەم

كار/تان دەكەم

كار/یان دەكەم

ج ــ جێناوی لكاو لەگەڵ كاری تێنەپەڕی دەمی ڕابووردوودا :

برا/م هات

برا/ت هات

برا/ی هات

برا/تان هات

برا/یان هات

د ــ جێناوی لكاو لەگەڵ كاری تێنەپەڕی دەمی ڕانەبووردوودا :

باوك/م دێ

باوك/ت دێ

باوك/ی دێ
باوك/مان دێ
باوك/تان دێ
باوك/یان دێ

**جێناوە لكاوەكان :**

(ـ م ، ـ ت ، ـ ی ، ـ مان ، ـ تان ، ـ یان) بە (كار ، ناو ، ئاوەڵناو و ئامراز)ەوە دەلكێن •

لە دۆخی نـاوی ( بـەركاری ڕاسـتەوخۆ )دا بـە كارەوە دەنووسێ •

ئەو كارانەی كە سادەن و نیشانەكانی (دە ، ب ، نا ، نە ، مە) بە پێشدەكەوێ ، ئـەوا جێناوە لـكاوەكان دەكەونـە دوای ئەم نیشانانەوە ، بۆ وێنە :

دە/ت/بینم
ب/ی/نووسم
نا/ی/بەم
نە/یان/بردم
مە/ی/خوێنەوە

ئەگەر كارەكە داڕێژراو وەیا لێكدراو بوو ، جێناوی لكاو دەكەوێتە نێـوان پێشگر و كارەكـە وە نێوان كار و پاشـگر لە داڕێژراودا وە نێـوان هەردوو ووشـە لێكدراوەكە لـە كرداری لێكدراودا ، بۆ وێنە :

پێ/م/كڕی
هەڵ/ی/كرد

دا/ مان/ خست
لێ/ یان/ کۆڵیۆه
کرد/ مان/ ەوە
خوارد/ یان/ ەوە
سەر/ یان/ خە
زین/ ی/ کە

لە دۆخی ناوی (بەرکاری/ مەفعولی)دا جێناوە لکاوەکان بە بەرکارەوە دەلکێن ، گەر بەرکارەکە لاچوو ئەوا بە ئامرازی پێوەندی‌یەوە دەنووسێن :

ئەو نامە/ م بۆ دەنووسێ
ئەو بۆ/ م دەنووسێ
بۆ/ م دەنووسێ
ئەو چیرۆك/ م بۆ دەخوێنێتەوە
ئەو بۆ/ م دەخوێنێتەوە
بۆم دەخوێنێتەوە

گەر بەرکار دیارخەر (مضاف الیە)ی لەگەڵ بوو ، جێناوی لکاوی جۆری یەکەم بە دیارخەرەوە دەنووسێ ، وەك :

کتێبێکی بە سوود/ مان کڕی .

گەر دیارخەر لەم ڕستەیەی سەرەوە لابردرا ، جێناوەکە بە بەرکارەوە دەلکێ :

کتێبێك/ مان کڕی .

جێناوە لکاوەکان لە ڕۆڵی دیارخەردا هەمیشە بە دیارخراوەوە دەلکێن :

دایە/م خۆش دەوێ

باوك/م نووسەرە

وولات/مان خۆشە

نێو/یان چییە ؟

باخچە/ی گەورەیە

هێڤی/ت زۆرە

**جێناوی لکاوی جۆری دووەم :**

جێناوی لکاوی جـۆری دووەم هەمیشـە لـە دۆخی کارایی (الحالة الفاعلیة)دا دەبێ بەم شێوانەی ژێروو :

لەگەڵ کاری تێنەپەڕی دەمی ڕانەبوردوو و ڕابووردوودا ، یەکسەر بە کارەکەوە دەلکێ :

**أ ـ دەمی ڕانەبووردوو :**

دەچ/م

دەچ/ی

دەچ/ێ

دەچ/ین

دەچ/ن

دەچ/ون

**ب ـ دەمی ڕابووردوو :**

چوو/م

چوو/ی

چوو/٠

چوو/ین

چوو/ن
چوو/ن

جێناوی لـکاوی جۆری دووەم لەگەڵ کاری تێپـەڕی دەمی ڕانەبووردوو دێ و یەکسەر پێوەی دەلکێ :

دەنووس/م
دەنووس/ی
دەنووس/ێ
دەنووس/ین
دەنووس/ن
دەنووس/ن

گەر جێناوی لکاوی جۆری دووەم لە دۆخی نێوی‌دا بێت ، ئەوا دەکەوێتە دوای جێناوی لکاوی جۆری یەکەم لە کاری دەمی ڕابووردوودا :

دیت/یان/ی ، دیت/مان/نن ·

لە شێوەی کرمانجی ژووروودا جێناوی لکاوی کەسی سێیەم (ێ) هەیە ، ئیتیمۆلۆژی ئەم جێنـاوە دەگەڕێتەوە سەر جێناوی نیشانە · ئەم جێناوە لە ڕستەدا دەوری بـەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبینێ وە یەکسەر بە کارەوە دەلکێ ، بۆ وێنە :

هەر مرۆڤەکی ئالایەکی ددەستی ڕاکەموبێژمێ ·

(لێبۆك ـ٣٩)

جێناوی لکاوی کەسی سێیـەم (ـ ێ) بە هێندێك ئامرازی پێوەندی‌یەوە دەلکێ ، بۆ وێنە :

تاجدين : کچێ خۆدين نەکە ‥ «تاجدين بترس ژێنێزيك دبيت» ‧

(لێبۆك ـ ٣٢)

ئەم بارە لە ديالێکتی کرمانجی خوارووشدا بەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە :

تۆ چيت لێ دەوێ ؟

# بەشی چووارەم

## ئاوەڵنــاو

ئاوەڵناو : ـ بەشێکی ئاخاوتنە ، شێوە و جۆری شت پیشان دەدا وە بە کاتەوە نەبەستراوە ٠

### باسی یەکەم :

### جۆرەکانی ئاوەڵناو

ئاوەڵناو لە ڕووی پێکهاتنەوە دوو چەشنە :

١ ـ ئاوەڵناوی سادە

٢ ـ ئاوەڵناوی ناسادە

**١ ـ ئاوەڵناوی سادە :**

ئەو ئاوەڵناوەیە ، کە تەنێ لە ووشەیەك پێك هاتبێت وەك :
گەورە ، درێژ ، رەق ، کورت ، رەش ، تاریك و ٠٠ـ هتد

وەك :

ئێستا بیست گەڕەکی گەورە گەورەی هەیە

(ئایا گوناهبارە ـ ١٩)

نینۆکە هەڵگەڕاوەکەشی ئەوەندە درێژ و ڕەق بوو ئەتووت پشتی کیسەڵە

(پاڵـتۆ ـ ١٩)

پاش ماوەیەکی زۆر کورت پەڵە هەورێکی ڕەش و تـاریك دایپۆشی

(ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ٥٣)

## ٢ ـ ئاوەڵناوی ناسادە : ـ

ئەو ئاوەڵناوەیە لە ووشەیەك و بەندێك وەیا دوو ووشە پێك هاتبێت •

لەبەر ڕۆشنایی‌ئەم پێناسەی سـەرەوەدا ئاوەڵناوی ناسـادە دوو جۆرە :

جۆری یەکەم : ئاوەڵناوی داڕێژراو

جۆری دووەم : ئاوەڵناوی لێکدراو

### جۆری یەکەم : ئاوەڵناوی داڕێژراو :

ئاوەڵناوی داڕێژراو بە یارمەتی پێشگر و پاشگر دروسـت دەبێ بۆ سازدانی ئاوەڵنـاوی داڕێژراو هێندێ پێشـگر و پاشگر هەن ، کە دەچنە سەر (ناو ، ئاوەڵناو و کردار)ی سادە

**أ ـ ئەو پێشگرانەی دەچنە سـەر ناوی سـادە و دەیکـەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو •**

لە زمانی کوردی‌دا دوو پێشگـر هەن ، کـە دەچنە سەر ناوو ئاوەڵناوی داڕێژراوی لێ دروست دەکەن •

**١ ـ پێشگری بێ ـ ٠ وەك :**

بە توندی مەڕ گوتی ئەی شێتی بێ هۆش
لە سایەی جلك و بەرگی خۆمی داپۆش

(خۆشی و ترشی ـ ٧)

دەبێ گەدا بم ، فەقیرو بێکار
هەتا دەبینم ڕومەتی نازدار

(بارام و گوڵئەندام ـ ٤٣)

بێخزمو بێکەس فڕێدرامە ئەم جیهانە سەختەوە

(مەسەلە ویژدان)

لە داوێنی گەڕەکی پیرمەسوور لە شاری سلێمانی چرایەکی بچووك و بێتین داگیرسابوو

(پەڵە هەورێکی چلکن ـ ١٦)

**٢ ـ پێشگری بە ـ وەك :**

دەستی لە گۆڕینیشا بەهێز بوو

(زمانو ئەدەبی کوردی ـ ٩٨)

ئیشەکەی بەلاوە خۆشو بەتام بوو

(پاڵتۆ ـ ٧)

تا ئێستە پیاوی بە جەرگی وام چاوپێ نەکەوتوەو ناکەوێ

(بەیان ـ ٤)

**ئەو پێشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵنــاوی سادە وە ئاوەڵناوی داڕێژراوی لێ ڕۆدەنێن :**

**١ ـ پێشگری نه ، وەك :**

بە گوڵزاری کەرەم قوربان دەپرسی گەر لە ئەحواڵم
نەخۆش و مەست و سەرخۆش و خوماری چاوەکەی کاڵم
(وەفایی)

**٢ ـ پێشگری نا ، وەك :**

تەزوویەکی ناخۆش بە هەموو گیانیا هات ·

(زەردە خەنە ـ ١٢)

بە کەسێکی ناپاك دەوترێت دەست بۆ خراپە درێژ بکات
(پەندی کوردی ـ ٦٢)

هاوەڵێتی مرۆڤی ناڕاست مەکە ·
یەکێ لە کاروانچیەکان ناساغ و ماندوو بوو
(ڕۆشنبیری نوێ)

ئەو پاشگرانەی ئاوەڵناوی داڕێژراو لە ناوی سادە دادەڕێژن ئەمانەن :

(ی ، ن ، ین ، وەر ، ەوەر ، ناك ، انە ، انی ، ەکی ، وو ، باز ، ور ، دار ، اوی ، و ···)

**١ ـ پاشگری ـ ی (نسبی) ، وەك :**

سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکوکی و سەید عومەری برای و حاجی عەبدولکەریمی سابڵاخی لەگەڵ بوو
(وەفایی ـ ٥)

پێشکەش بە بیســتونۆیەمین بیرەوەریی کــۆچی دووایی‌ی داماو حوزنی موکریانی بێ
(زمانی یەکگرتووی کوردی ــ ٣)

**٢ ــ پاشگری ــ ن ، وەك :**

(ئەکاکی)شەرمن و پەشۆکاو لە ڕووی ساکاری و دڵپاکی‌یەوە وای‌زانی ئەم تیپەی کە گۆرانی بەسەر پاڵتۆکەیا هەڵئەدا بە ڕاستیەتی
(پاڵتۆ ــ ٤٥)

سنگە تووکنە چڵکنەکەی هەلکڕان
(١٠ چیرۆك ــ ٨٣)

دەستی منداڵێکی خڕیلەی وورگنی گرتبوو
(ڕۆشنبیری نوێ ــ١٤)

**٣ ــ پاشگری ــ ین ، وەك :**

ساقی سەرەکەم بێ بە فیدای گەردنی شووشەت
بەو جامە بلوورینە لە بۆم تێکە پەیا پەی
( نالی )

یەخەکەت بە گوڵنکەی زێوین بۆ ئەڕازێنمەوە
( پاڵتۆ ــ ٣٠ )

دەبێ عمرە گێل چ دەنگێکی ئاگــرین و سۆزداری هەبووبێ باوکی گریاندبێ ٠
(ڕۆشنبیری نوێ ــ ٦٣ )

٤ ـ پاشگری ـ و ەر • وەك :

دەسکاری ئەوین لە خاك و خۆڵین
گەر بەختەوەرین و گەر کلۆڵین

(مەم‌و زین ـ ١١)

٥ ـ پاشگری ـ ناك • وەك :

من بە چ کارێکی سامناك هەڵساوم •

(فریشتەکانی سەرزەمین ـ ١٠)

هاتووین ئەبێ ببین چ‌شاد چ خەمناك

(چیرۆکی جوان ـ ٢١)

٦ ـ پاشگری ـ انە • وەك :

چونکە جارێ هیچ بەڵگەیەکی ژیرانەی بە دەستەوە نی‌یە •

(ئاسۆی زانکۆیی ـ ٤)

نە ئەوەشە ئەمانەتی زانستانەی پاراستبێ و چۆن نووسراون ئاوا بیان نووسێتەوە •

(ئاسۆی زانکۆیی ـ ٤)

گیانەکەم ، ئەمما دڵی من لەو دڵە شێتانەیە
بێ‌ئەوەی هیچ شك‌بەرێ کوژراوی ئەو چاوانەیە

(هەردی)

٧ ـ پاشگری ـ انی • وەك :

جل‌وبەرگی پیاوانی لەبەردا بوو بۆیە کەس نەیناسیەوە
پیاوێکی شەڕانی‌یە دایمە لە شەڕە

(هاوکاری)

**٨ ـ پاشگری ـ ەکی ٠ وەك :**

عومەر دەشتەکی کتێبی پەندی کوردی لە ساڵی ١٩٧٢ دا چاپ کردووە ٠

بەهرە دەکات بە پاڵپشتێکی سەرەکی خۆی

(بەیان ـ ٣٣/٤٦)

ئەم کورتە سەرگزەشتەیەی حاجی لە پێشەکیی ( دیوانی حاجی قادری کۆیی) بە پێنووسی مامۆستا (گیوی موکریانی) وە لە مێژووی (ئەدەبی کوردی)ی وەرگیراوە

(حاجی قادری کۆیی ـ ٧)

**٩ ـ پاشگری ـ وو ٠ وەك :**

میرێ هەبوو ڕۆژگاری پێشوو
دڵخوازی بە چی هەبوو هەمووی بوو

(مەمو زین ـ ١٩)

چاوینی پەروین بوو دیری سەروو
چاڵی چەنەگە پڕی لە ٠٠٠ جادوو

(مەمو زین ـ ٢١)

**١٠ـ پاشگری باز ٠ وەك :**

دڵنیام کە خواش هەر لایەنی حەق ئەگرێ و پیاوی فێڵباز سەرەنگری و ڕیسوا ئەکات ٠

(لالۆ کەریم ـ ٢٧)

**١١ـ پاشگری ـ ور ٠ وەك :**

هێندێ جار لە ژێر نازنێوی ڕەنجوریشدا شتی بلاو

دەکردەوە ٠

**١٢ـ پاشگری ـ دار ٠ وەك :**

بە زۆری ئەو نووسراوانـەی ئەخوێندەوە ، کە تێرابوون بۆ ئەو مرۆڤـە ناودارانەی کە ماوەیەکی کەم لەوەبـەر روتبەی گرنگیان درابوویە ٠

(پاڵتۆ ـ ١٢)

تا دەسـتە گوڵە ناسك و نازدارەکەم بە شـاداوی ئەڤینی و خۆشەویستی ڕاستەقینە ئاو بدا ٠

(هاوکاری ـ ٣٩٥)

**١٣ـ پاشگری ـ آوی ٠ وەك :**

چـاوی خەواڵـووی کچۆڵـەکانی گونـدە بەفـراوی و ئاگرینەکانی کوردستانی ئازیزمان دەخەنەوە بیر ٠

(بەیان ـ ٢٧/٤٦)

ها ٠٠ شێتی خێڵی قوڕاوی ، ئەبینم شارت بەجێ نەهێشت ؟

(١٠ چیرۆك ـ ٨١)

لە سەرەتای شیعرەکەدا قەقنەس و سەمەندەر بەیەك دەگەن و چیرۆکی ئاگراوی خۆیان بۆ یەکتری دەگێڕنەوە ٠

(بەیان ـ ٢٥/٤٦)

**١٤ـ پاشگری ـ ین ٠ وەك :**

دەشتێکی بەرین و کاکی بە کاکی بوو ٠

**ب ـ ئەو پاشـگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سـادە و ئاوەڵناوی داڕێژراویان لێ ساز دەکەن :**

**١ ــ پاشگری ــ ۆڵ ٠ وەك :**

بگرە هەتا حەز بکەیت ڕەنگی ڕووت و شڕۆڵو پیسو پۆخل بوو ٠

(لالۆ کەریم ــ ٢)

**٢ ــ پاشگری ــ ۆڵە ، وەك :**

ئەی کچە جوانەکەی سەر گۆنا نەختێك ئاڵ
ئەی ئەندام وردیلەی نەرمۆڵەی ئێسك سووك

(گۆران)

هەندێکی کەشیان ئەچوونە (تیاترۆخانەیەك) بۆ ئەوەی بە قەدو باڵای کچێکی نەشمیلەی ناسکۆڵەدا هەڵ بدەن ٠

(پاڵتۆ)

حاجی هەتا ئەهات بلێت و بڵخ و شڕۆڵە و پیس پۆخل بوو٠

(١٠ چیرۆك ــ ١٩)

**٣ ــ پاشگری ــ وور ٠ وەك :**

لە ناو زولفا ڕوو دڵدارە مەستوور
دەسووتێنێ لە شەودا شەمعی کافوور

(سالم ــ ٦٣)

**٤ ــ پاشگری ــ ۆکە ٠ وەك :**

ئاغا منداڵێکی گێژ و وێژ و گێلۆکەی هەیە ٠

**٥ ــ پاشگری ــ اك ٠ وەك :**

چارەی ترش و تاڵی ڕووناك کردووە ٠

(ژانی گەل)

٦ ـ پاشگری ـ کەلە ٠ وەك :

کچێکی نازداری جوانکەلەی بە لادا تێپەڕی ٠

(١٠ چیرۆك ـ ٦٨)

٧ ـ پاشگری ـ ەلە ٠ وەك :

پیاوێکی درێژی باریکەلە بوو ٠

(١٠ چیرۆك ـ ٢٧)

٨ ـ پاشگری ـ یلە ٠ وەك :

لوتێکی باریك و ووردیلەی هەبوو ٠

(دارەکەی بەرماڵمان ـ ٩)

٩ ـ پاشگری ـ لکە ٠ وەك :

منداڵێکی خڕیلە و سپیلکەی لەگەڵ بوو ٠

١٠ـ پاشگری ـ یل ٠ وەك :

کردیل و وردیل پاڵەوانی چیرۆکێکی منداڵانن ٠

**جـ ـ ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەچنە سەر ڕەگی کردار و ناوی چاوگ و دەیکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو :**

١ ـ پێشگری ، نە ، دەچێتە سەر ڕەگی کردار و ئاوەڵناوی داڕێژراو ساز دەکات :

ئافرەت ـ سەرچاوەی خورپەی دڵی نەبا ٠٠ هێگۆ نەیدەتوانی لەسەر یەك تەل سازلێدەری سەدان ئاوازی نەمری پڕ لە جۆش و خرۆش بێ ٠

(هاوکاری ، ژمارەی تایبەتی ــ ١/١/٧٢)

گیاندارو نەبوو دیارو نەدیار
زاناو نەزان و گێلو و وشیار

(مەم‌وزین ــ ٥)

٢ ــ پاشگر :

١ ــ ــ ۆك ٠ وەك :

بە هـۆی گەڕۆکەکانیانەوە ئـەو یارییانەیان لـە کوردان وەرگرتووە ٠

( د ٠ کوردی ــ ٧ )

یەکێ لە سیانەکە پەلی منالە گرینۆکەکەی گرت ٠

( بوار ــ ١٧ )

٢ ــ ــ ەك ، وەك :

کاتێك کـە بێکار دەبم دادەنیشم لە درکی رووەك خەنجەر دروست دەکەم ٠

( ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە ــ ١٢ )

٣ ــ ــ ا ، وەك :

مەلایـەکـی بالا بەرزی چـوارشـانەی دنیـا دیدەی زانـا سەرپەرشتی ئەم مزگەوتەی ئەکرد ٠

( لەسەر زەردەخەنەیەك ـ ٦ )

٤ ـ ـار ، وەك :

لە دوور دوور دیارە • دیار دەڵێی پشكۆیە

( هاوكاری ـ ٤١٣ )

٥ ـ ـ وو ، وەك :

نووسەری سەركەوتوو هەمیشە لە بەرهەمەكانی‌دا جۆرە تایبەتێتی و شێوەیەكی دیاری پێوە ئەبێت •

٦ ـ ـ ی ، وەك :

ڕێویەكی گەڕڕۆك لە شێرەكی نوستی چێترە •

( پەندی كوردی )

**جۆری دووەم : ئاوەڵناوی لێكدراو**

ئاوەڵناوی لێكدراو لەمانەی خوارەوە پێك‌دێت :

١ ـ ناو+ئاوەڵناو • وەك :

(پیتروڤیچ) عادەتی وابوو ، كە دڵخۆش و سەركەرم بوایە •

(پاڵتۆ ـ ٢٠)

ئەحمەدیان كوڕێكی كەڵەگەتی چوارشانەی گورج‌وگۆڵ و زۆر ڕووخۆش بوو •

(لەسەر زەردەخەنەیەك ـ ٧)

خوا هەڵناگرێ مێردە سەرخۆشەكەی بەو هەقدەستە كەمە ڕازی ئەبێ •

(پاڵتۆ ــ ٢٠)

٢ ــ ناو+ناوی بەرکار • وەك :

دیسانەوە دەرەقەت نایەم ئەوسا ورگ دڕاو و سەر شکاو دەرئەچم •

(پەڵە هەورێکی چڵکن ــ ١١)

دڵسووتاو و جەرگبڕاو کۆڵان بە کۆڵان دەربەدەر
کەس بە دەردی من نەچێ دوور کەوتەیی یار و دیار

(سالم ــ ٦١)

٣ ــ ناو+ناو • وەك :

بەژن چناری ڕوو بە خاڵ بەرەو لام هات •

(هاوکاری ــ ٢١٣)

گەردن بلوور دیارە لە دوور
لە هەردە و دەوری شارەزوور

٤ ــ دوو ناو بە یارمەتی ئینتەرفێکسی ( بە ) :
مەپرسە بۆچی مات و خەمبارم
بۆچی ڕەنگزەردم ، بۆ لێو بە بارم

(کاکەی فەلاح)

٥ ــ ناو + ڕەگی کردار • وەك :

وا سەربەستی وەکو سەربەستی ناگیرێ
تەمەنێکی پڕ ئاواتی لە خەیاڵ نەبێ نابینرێ •

(ك • م • [illegible])

٦ ـ ناوی شوێن + ناوێکی سادە ٠ وەك :

گەلی ژێر چەپۆك سەربەست نـابێ ، تا ئافرەتی لەماڵەوە بەسترابێتەوە ٠

(ئافرەت لە هونراوەی کوردیدا )

٧ ـ ژمارە + ناو ٠ وەك :

مشتومڕ لە نێوان وێژدان و پەنجەیا دەستی پێ کردبوو وا دوودڵ دەرئەکەوت ٠

٨ ـ ئاوەڵناو + ناو بە یارمەتی ئنتەرفێکسی ( ە ) ٠ وەك :

لالۆ پیرەمێردێکی کەڵەگەتی ڕەقەڵەی مل باریك بوو

(لالۆ کەریم ـ ١ )

٩ ـ ئاوەڵناو + ڕەگی‌کردار ٠ وەك :

بەڵام ژنەکـەی ئافرتێکی ڕەش‌پۆشـ و کـەتەی دەم و چاو زەرد و ژاکاو بوو ٠

(بژی مرۆف ـ ٣٨)

١٠ـ ئاوەڵناو+ووشەیەکی ناسەربەخۆ بە یارمەتی ئینتەرفێکسی ـو ٠ وەك :

بەڵام نەك بە ووتەی پچڕپچڕ ، بەڵکو بە ووتەی ڕێك‌وپێك و شێوەی ڕەپوڕەوان ٠

(پاڵتۆ ـ ٢٨)

چەند ڕێگایەکی هەتا بڵێیت چۆڵ‌وهۆڵ دەرکەوت ٠

(لە خەوما ـ ٢٩)

قاچە نوشتاوەکانی ڕووت‌و قووت بوون ٠

١١ ــ به دووپات كردنه‌وه‌ی ئاوه‌ڵناوێكی ساده ٠ وه‌ك :

به شه‌و خه‌وی خۆش خۆشی ئه‌دی به قوماشی پاڵتۆكه‌یه‌وه ٠
(پاڵتۆ ــ ٣٤ )

وه‌كوو قه‌نادی خۆش سه‌ودا به زوو زوو بیده‌ بستێنه ٠

---

● گه‌ر به‌راوردێـك له نێوان ئـه‌م ووشه ناسه‌ربه‌خۆیانـه (ــ پێك ، ــ هۆڵ ،

● گه‌ر به‌راوردێـك له نێوان ئـه‌م ووشه ناسه‌ربه‌خۆیانـه (ــ پێك ، ــ هۆڵ ، ــ قووت) وه ووشه سه‌ربه‌خۆكانی (رێك ، چۆڵ ، رووت) بكه‌ین ، ئه‌وه‌مان بۆ روون ده‌بێته‌وه ، كه‌وا له‌مانه‌دا هه‌ر یه‌كه‌مین فۆنێمی هه‌رسێ ووشه‌كان گۆڕاوه ، ئه‌م شێوه داڕشتنه له زمانی كوردیدا له ووشه‌ی داڕێژراوی دیشدا هێندێك جار به‌رچاو ده‌كه‌وێ ٠

**باسی دووەم :**

لە زمانی کوردیدا هیــچ نیشانەیەکــی ڕێزمانی نی‌یە ، کە ئاوەڵناو لە ناو جیابکاتەوە •

ئاوەڵناو دۆخ ، ڕەســەن و ژمارە پێشــان نادات بەڵام ناو پێشانیان‌دەدات

نیشانەی نەناسیاری (ـێك) بە ئاوەڵناوەوە نالکێ •

لە نێو ئەو نیشانانەی ، کە دەچنە سەر ناو تەنێ نیشــانەی ناسیاریـەکەـبە ئاوەڵناوەوە دەلکێ لە کاتێکدا ، کە ئاوەڵناوەکە دەبێتە تەواوکەری ناوەکە ، بۆ وێنە :

مێردە لاوە باریکەڵەکەشی لە ژوور سەری دانیشتبوو

لە بازێڕە چووکەکەمدا پێشانگای چەند هونەرمەندێکی تازە پێگەیشتووی لاڤ‌کرایەوە •

(ئاسۆی زاگرۆیی ــ ٤)

چاوە شینەکانی پیری کاروان لە ستێران دەچوون

(ئەفسانەی چیای ئاگری ٧٨)

(پاڵتۆ ــ ١١)

ناو لە ڕووی دارشتنەوە بەشداری پێك‌هێنانی ئاوەڵناوی ناسادە دەکات بە هاوکاری پێشگر وە یا ووشەیەکی سەربەخۆوە • وەك :

بێ‌هۆش ، بێ‌هێز ، بەکار ، بێ‌تام ، دڵخۆش ، سەرگەرم •• هتــد •

هەروا ئاوەڵناویش دەورێکی باڵا دەبینێ لە دارِشتنی ناوی دارِێژراوو ناوی لێکدراو ، وەك :

ئـــازادی ڕووناکی سەوزە ڕەشکە ســـەوزەگیا ڕەشـــەبا کێلەشین و ٠٠٠ هتـــد ٠

**باسی سێیەم :**

## ئاوەڵناو لە ڕووی پلەوە

کە هیچ نیشانەیەکی ڕێزمانی پێوە نەلکاوە :

ئاوەڵناو لە ڕووی پلەوە دەکرێ بە سێ بەشەوە :

١ ـ پلەی چەسپیو :

وەك مەلێکی زامدار لە پرِ کۆنە هێلانەیەکی بێتەوە بیر ٠
بەڵێن بێ پاڵتۆیەکی وا تازەت بۆ بدروومِ هێشـــتا کەس لە
بەری نەکردبێ

(پاڵتۆ ـ ٢٩)

٢ ـ پلەی بەراوورد

پلەی بەراورد لە زمانی کوردیدا بە یارمەتی نیشانەی (ـتر) پێك دێ ٠ لە ڕستەدا ئامرازی پێوەست (لە) دەکەوێتە پێش

ئەو نێوەی ، کە بەراوردی لەگەڵ دەکرێت :

شەرت بێ ئەگەر کچم ببێ ئاهەنگێکی لە هی کوڕان خۆشتری بۆ بکەم

(پیترۆڤیج) فەرمووی : لەم قوماشە جوانتر لەوە نایابتر لە هیچ جێیەك چنگ ناکەوێ

(پاڵتۆ ـ ٣٥)

سلاوێك لە پەڕی گولاڵە ناسکتر ، لە گزنگی خۆر جوانتر لە هەنسکی ڕەشەڕەیحانە بۆنخۆشتر ٠٠٠

(یەکەم هەنگاو ـ ١٣)

چ لەمە نەنگ و سووك و کرێت تر دەبێ بۆ من
(ئەفسانەی چیای ئاگری ٢٢٠)

٣ ـ پلەی باڵا : پلەی باڵا بەم شێوانەی خوارەوە پێك دێت :

١ ـ بە یارمەتی نیشانەی (ترین) ساز دەبێت ، کە دەکەوێتە کۆتایی ئاوەڵناوەوە ٠

چاوم جوانترین دیمەنی خۆشەویستی لە بوونی ئەم دوو دڵدارە بەدی دەکرد

(هاوکاری ـ ٣٩٤)

بە راستی ئەو ڕۆژە گەورەترین جەژنی شادی بوو لە ژیانی ئەکاکی بەسەزماندا

(پاڵتۆ ـ ٤١)

کوڕوکاڵ ، کچان ، ژنان ، بە جوانترین و ناسکترین بارێکی تیرەی ئینسان پەسندی کا گۆوەند و شاییان گێڕا ٠
(ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ١٢١)

٢ ـ هێندێ جار بە یارمەتی وشەی( هەرە) لەگەڵ ئاوەڵناوی چەسپیو پێك دێت :

هەرەسارد ، هەرەقووڵ ، هەرەدڵخۆش ٠

٣ ــ بە یارمەتی وشــەی لەهەموو/لەهەمووان لەگەڵ ئاوەڵناوی
پلەی بەراورد :
لەهەمووان ئازاتر با بێتە پێش ٠
لەهەموو گەورەتر ٠

# بەشی پێنجەم

## چاوگ

### پێناسینی چاوگ :

لەهەموو زمانێکدا چاوگ هەیە بەم جۆرەش لەزمانی کوردیدا ... بۆیە پێناسینێکی گشتی هەیە کە هەموو چاوگ دەگرێتەوە لە زمانی سرۆڤایەتیدا ، بەلام لەپاڵ ئەو هاوبەشییەدا ، هەر زمانە تایبەتێتی خۆی هەیە لە دارشتن و بەکارهێنانیدا ، بۆیە پێناسینی تایبەتیش هەیە . بەتێگەیشتنی هەردوو پێناسینەکە لێرەو لە هەر باسەدا ئینجا دەگەین بە پێناسینی تەواو و هاوبەشی و جیاوازیشیان دەزانین لەناو خۆیاندا و ئەو دراساتانەشمان بۆ روون دەبێتەوە کە لەو زمانانەدا کراون و بە پێی پێویست و گونجانیان لەگەڵ زمانەکەماندا ، دەتوانین لە زمان و رێزمانەکەمان بکۆڵینەوە بە شێوەیەکی راست و لەژێر تیشکی زانستی و رۆشنایی ئەو دراساتانە .

کەواتە لێرەدا بەم پێیە چاوگ روون دەکەینەوە :

### ١ ـ پێناسینی گشتی :

چاوگ صیغە و ئێسکی فرمانــە و لە ناوەوە نزیکە ، واتە وێنەیێکی نەگۆڕاوی فرمانە و نە کەس و نە کات و نە ژمارەی تێدا نیە و بە گشتی سەرچاوەیە بۆ فرمان و گشت وەرگیراوەکانی ئەمەیە بە گشتی پێناسینی چاوگ کە زمانی کوردیش دەگرێتەوە بۆنموونە ٠

خواردن بۆ ژیان پێویستە ٠

خوێندن و نووسین وەك ئاو و هەوایە بۆ مرۆڤ ٠

سەرکەوتن بۆ گەلە و مردن و نەمان بۆ دوژمن ٠

بە تێکۆشان هەموو میللەتێك پێش دەکەوێت ٠

لەو نموونانەدا :خواردن ، ژیان ، خوێندن ، نووسین ، سەرکەوتن مردن ، نەمان ، تێکۆشان ، چاوگن ٠ ٠ ٠

واتە هەر یەکە لە خۆیدا کارێك دەردەخات و هەر یەکەش لە ئێمە بە ئاســانی تێی دەگات و دەیزانێت ، کە دەڵێــین (خواردن) لە ڕستەی یەکەمــدا ٠٠٠ یەعــنی بــاسی کاری فرمــانی خواردن دەکات ، نەك خوێندن ، یان هاتن ، کارەکە (خوواردن)ە ، واتە (صیغە)ی کارەکە لە هەر چاوگەدا دیارە ئاشکرایە ، بۆ نموونە ئەگەر یەکێك بڵێت باسی چ کارێك دەکەیت ، یان مەبەستت کام کارە ؟ لە وەڵامدا دەگوترێت :

مەبەستم لێــرەدا کاری (خواردن)ە ، یــان (خوێندن)ە یان (سەرکەوتن) یــان (تێکۆشان)ە لــە ڕســتەکانی تــردا، کەواتە چاوگەکە فرمانەکە دەستنیشان دەکات یەکسەر ٠

هەروەها هەر (چاوگ)ەش لە هەمان کاتدا ناوە بــۆ کار و فرمانەکە ٠

بۆ نموونه که دەڵێین :

بە (دیتن)ی دڵم دەگەشێتەوە ٠

بە (بینین)ی چاوم ڕوون دەبێتەوە ٠

(ژیان) و نائومێدی ناگەن بە یەك ٠

مەژی بۆ (مردن) بمرە بۆ (ژیان) ٠

کە دەڵێین ــ هاتــن ٠٠٠ مــردن ، ژیان یا هــەر چاوگێك وەربگرین لە هەمان کاتدا ناوە چونکە کە یەکێك دەڵێت ئەو کارە ناوی چیە ؟ دەڵێین ناوی (هاتن)ە ، یان (مردن)ە ، یان (ژیان)ە ٠٠٠٠ هتد ٠

**باسی یەکەم :**

## تایبەتیەکانی چاوگ لە زمانی کوردیدا

دەرخستنی تایبــەتێتی چاوگ لە هەر زمانێکــدا دەتوانین بڵێین پێناسینی تایبەتی چاوگ دەگەیێنێت لەو زمانەدا ٠

هەر وەك لــە ڕێی پێناسینی گشــتییەوە پێوەنــدیی تێوانی زمانــەکانی مرۆڤایــەتی دەنــاسیت ، لــە ڕێــگەی پێناســینی تایبەتیشەوە دەتوانین دەست بخەینــە سەر جیاوازیی هەر زمانە لەوی تر لە هەر بەشەدا و ناسینی وەك زمانێکی سەربەخۆ ٠

ئێستا با بێینە سەر خاسیەتەکانی چاوگ لەم زمانەدا :

ئەگەر سەرنجی ئەم کۆمەڵە چاوگە بدەین :

١ ــ سووتان ، کــوڵان ، کێــڵان ، پێــوان ، هێنــان ، گریــان ، هەڵستان ، ڕژان ، ڕووخان ، دان ٠٠٠ هتد ٠

٢ ــ کەوتن ، نوستن ، خستن ، هەڵگلۆفتن ، ناشتن ، کرۆشتن ، داخستن ، ڕشتن ، پاراستن ، خواستن ٠٠٠ هتد ٠

٣ ــ کردن ، مردن ، بردن ، خواردن ، ناردن ، هاوردن ، بژاردن، ژماردن ، چاندن ، ڕاکردن ••• هتد •

٤ ــ چوون ، بوون ، گروون ، دروون ، هەڵچوون ، هەڵبوون ، ڕابوون ، هەڵدروون ، لاچوون ، لاڵبوون ••• هتد •

٥ ــ نوسین ، کــڕین ، دڕین ، ســڕین ، چنین ، هانین ، خزین ، تەقین ، تۆقین ، زانین ••• هتد •

## باسی دووەم (نوونی چاوگ) :

١ ــ ئەگەر ســەرنجی هەر یەکە لەو چاوگانەی ســەرەوە بدەین دەبینیــن لــە پێش ( نــوون ) ی چــاوگ پیتێــك هــەیــە بەم جــۆرەش هەموو چاوگێك لــەم زمانەدا(١) کۆتــایی بەم پیتی (ن)ە دێت ••• واتە چاوگ نیە لەم زمانەدا کۆتایی بە پیتی (ن) نەهاتبێت •

بۆیە بەم (نوون)ە دەگوترێت (نوون)ی چاوگ •

٢ ــ ئەگەر دووبارە سەرنجی ئەو چاوگانە بدەین دەبینین کراون بە پێنج بەشــەوە ، ئەگــەر ســەرنجی هــەر بەشــە بدەین بەتایبــەتی پیتی پێش (نوون)ی چــاوگ لە هــەر بەشەدا دەبینــین پێش ( نـــوون )ی چـــاوگ پیتێـــك هەیـــە ••• لە کۆمەڵی یەکەمدا (د ــ دال) لە دووەمدا (تی ــ ت) لە سێیەمدا ( ا ــ ) لە چوارەمدا (وو) لە پێنجەمدا (ی) •

بەم جۆرە ئەگەر هەر چاوگێك وەربگرین لەم زمانەدا دەبێت پێش نوونی یەکێك لەو پێنج پیتەی سەرەوە هەبێت ••• لە بەر

---

(١) هەروەها لە زمانی فارسیدا ئەوەی ئەم زمانە دەزانێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆی •

(٢) لە فارسیدا بە گشتی دوو نیشانەی چاوگ هەیە ، بگەڕێرەوە بۆ کتێبەکەی زهتابیو محفوظ •

ئەمە کراون بە پێنج بەشەوە ··· هەروەها دەتوانین ناوی ئەو پیتە لە هەر چاوگە بنێین ، بۆ نموونە : ئەگەر (یی) بوو پێیدەڵێین چاوگی (یائی) ئەگەر (دال) بوو (دالی) ، ئەگەر (تی) بوو (تائی) ، ئەگەر (وو) بوو (واوی) ، ئەگەر ( ا ) بوو الف)ی ·

## باسی سێیەم ـ نیشانەی چاوگ :

به نوونی چاوگ و پیتەکەی پێشی دەگوترێت (نیشانەی چاوگ) ·· کە ئەم پێنجەی خوارەوەن :

١ ـ دن : بوردن ، بواردن ، ڕابوردن ·
٢ ـ تن : پاڵاوتن ، سرەوتن ، بەستن ·
٣ ـ ین : مژین ، خەنین ، چەقین ·
٤ ـان : کێشان ئێشان ، ئاودان ، خوران ·
٥ ـ وون : بەربوون ، سوون ، هەڵدروون ·

## باسی چوارەم ـ بناغەی چاوگ :

بناغەی چاوگ چیە و چۆن پێکدێت ؟

بناغەی چاوگ بەو بەشە دەگوترێت کە پاش لادانی نوونی چاوگ دەمێنێتەوە ··· واتە ئەو بەشە چاوگەیە کە نوونی چاوکی لێ لابراوە و بەم جۆرە پێکدێت :

چاوگ ـ نوونی چاوگ = بناغەی چاوگ ·
خەوتن ـ ن = خەوت ·
بڕین ـ ن = بڕی ·
بناغەی چاوگ + نوونی چاوگ = چاوگ ·

کەواتە هەمــوو چاوگێك بناغــەی هەیــە و بــەو بناغەیە دەگوترێت، بناغەی چاوگ و تاقە یەك بنکەش هەیە بۆ وەرگرتنی ئەویش بە لادانی نوونی چاوگ‌ێك دێت ٠

## باسی پێنجەم ـ ڕەگی چاوگ :

هەر وەك هەموو چاوگێك بناغەی هەیەو بنکەیەکی دیار و ئاشکراشی هەیە بۆ وەرگرتن و دۆزینەوەی ، بەم پێیەش ، ڕەگی چاوگیش هەیە و بنکەی تایبەتیش هەیە بۆ دۆزینەوەی کە بەم جۆرەی خوارەوەیە :

چاوگ ــ نیشانەی چاوگ = ڕەگی چاوگ ، وەك :

هاتن ــ تن = هات ٠

لەرزین ــ ین = لەرز ٠

ترسان ــ ان = ترس ٠

کەواتە :

ڕەگی چاوگ + نیشانەی چاوگ = چاوگ ٠

هەروەکو تاقە یەك بنکە هەیە بۆ وەرگرتنی بناغەی چاوگ بەم جۆرەش تاقە یەك بنکە هەیە بۆ وەرگرتنی ڕەگی چاوگ ٠

یەکەمیان بە لادانی نوونی چاوگ پێك دێت ٠

دووەمیان بە لادانی نیشانەی چاوگ پێك دێت ٠

لێرەدا دەبینین کە پەیوەندییێك هەیە لە نێوانی :

١ ــ نوونی چاوگ ٠

٢ ــ نیشانەی چاوگ ٠

٣ ــ بناغەی چاوگ ٠

٤ ـ ڕەگی چاوگ ۰

یەك ـ هەر چواریان لە چاوگدا کۆدەبنەوە ۰

دوو ـ بە لادانی نوونی چاوگ بناغەی چاوگ دروست دەبێت و بە لادانی نیشانەی چاوگ ـ ڕەگی چاوگ دروست دەبێت ۰

چاوك – نوونی چاوك = بناغەی ـــــ

نیشانەی چاوك = رەگی چاوك

سەرنج : سەرنجی ڕەگی چاوگ بدەن کەهەمیشە بە پێی یەك بنکە پێكدێت کە بریتییە لە لادانی نیشانەی چاوگ لەگەڵ ڕەگی فرمان (کار) کە بە بنکەیێك زیاتر وەردەگیررێت سەرەڕای بوونی بیژۆك (شواذ) بۆ ئەمە بگەڕێنەوە بۆ هەردووکیان بۆ بەراوردی ۰

## ڕاهێنان :

١ ـ سوودی زانینی پێناسینی گشتی چیە ؟ یان زیانی چیە ؟

٢ ـ بوونی پێناسینی تایبەتی و خاسیەتی سەربەخۆ لە چاوگی کوردیدا چی دەگەیێنێت ؟ ئەو خاسیەتانە چین ؟

٣ ـ هاوبەشیی نێوانی زمانی کوردی و فارسی لە نوونی چاوگ و هەندێك نیشانەی چاوگدا بەڵگەی چیە ؟

٤ ـ نیشانەکانی چاوگ لە کوردیدا لە فارسی زۆرترن ، ئەمە چۆن ڕوون دەکەیتەوە ؟

٥ ـ نوونی چاوگ چیە و بۆچی وای پێ دەگوترێت ؟

٦ ـ چۆن چاوگ لەو وشانە جودا دەکەیتەوە کە کۆتاییان بە پیتی (ن) هاتووە ؟

٧ ــ چەند نیشانەی چاوگ هەیە لەم زمانەدا بیانژمێرن بە نموونەوە ،پاشان بگەڕێرەوە بۆ هەندێك سەرچاوە دەبینیت لەگەڵ ئێرەدا جیاوازن ، ئەمە چۆن باس دەکەیت و چۆن وەڵام دەدەیتەوە کاتی پرس کردن ؟

٨ ــ چاوگ ــ نوونی چاوگ =

چاوگ ــ نیشانەی چاوگ =

نوونی چاوگ + بناغەی چاوگ =

نیشانەی چاوگ + ڕەگی چاوگ =

٩ ــ چەند بنکە هەیە بۆ وەرگرتنی :

أ ــ بناغەی چاوگ ٠

ب ــ ڕەگی چاوگ ٠

١٠ــ دەوری بناغە و ڕەگی چاوگ چیە لە زماندا ؟

١١ ــ نووسەران چۆن باسیان کردوون ؟ بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەیێك یان زیاتر ؟

١٢ــ تێنەگەیشتنی ڕەگ و بناغەی چاوگ چ زیانێکی هەیە بە بەڵگە و نموونەوە و بە پێی توانا وەڵام بدەنەوە ٠

**تێبینی :**

لەوانەیە پرسیار هەبێت ئێستا وەڵامەکەی قورس بێت ، ئەو پرسیارانە نیشانە بکرێن تاوەڵامیان لە باسەکانی لەمەودوا دەدۆزنەوە ٠

**چاوگ**

چاوگ بە پێی کاری دەبێت بە دوو بەشەوە :

ڕوودانی کارێك ڕوون بکاتەوە ، بەمەرجێك باری کارەکە لە بکەر یان باسلێکراو نەچێتە دەرەوە بۆ سەر شتێکی دیکە •

واتە لە تێنەپەڕدا بکەر خۆی کارەکە دەکات و باری کارەکەش دەکەوێتەوە سەر خۆی • بۆ نموونە :

- میوانەکان پێش نەختێك ڕۆیشتن (ڕۆیین) •
- کێ ڕۆیشت ؟ میوانەکان
- کێ کاری ڕۆیشتنی کرد ؟ میوانەکان
- میوانەکان چیان کرد ؟ ڕۆیشتن

* دیوارەکە کەوت •

چی کەوت ؟ دیوارەکە

دیوارەکە چیی لێهات ؟ کەوت

کەواتە : بەو جۆرەی سەرەوە کە پرسیار دەکەین دەبینین ، پرسیار و وەڵام لە بەشەکانی ڕستە ناچنە دەرەوە کە فرمان و باسلێکراوەکەیە •

---

(١) چاوگە تێنەپەڕەکان بەمجۆرەش تێپەڕەکان هەرچەندە هاوبەشن لەتێنەپەڕیو تێپەڕیدا بەڵام جیاوازیش هەیە لە نێوانیاندا وەك مەرج نیە بە هەمان ڕێگە ڕەگی فرمانە کانیان وەربگیرێت ، هەروەها هەن بۆ حاڵەتنو هەن بۆ جووڵەن یەکەموەك(کەوتن)کە ماوەی ڕوودانی کورتە واتەیەکسەر ڕوودەدات دووەم وەك (ڕۆیشتن) بەردەوامی تێدا هەیە یان ماوە کێشان لە ڕوودانیدا ، هەروەها سەرنجی ڕەگی فرمانی هەردووکیشیان بدەن •

## نموونه بۆ چاوگی تێنەپەڕ

١ ـ هاتن ، نووستن ، خەوتن کەوتن ·

٢ ـ دڕان ، ڕژان ، ترسان ، پیشان ، برژان ، سووتان ، خنکان ، ئاوسان ، کۆلان ·

٣ ـ تەزین ، تەپین ، لەرزین ، تۆقین ، لەقین ، خزین ، کۆکین ، خەنین ، کەنین ، رزین ، تەقین ، چەقین ، وەرین ·

٤ ـ مردن ·

٥ ـ چوون ، بوون ·

وەك دەرکەوت بە نموونەکانی سەرەوەدا ، هیچ پێوەندییێك نیە لە نێوانی نیشانەی چاوگ و تێپەڕ و تێنەپەڕیی ·

واتە ناتوانین لە ڕێگەی نیشانەی چاوگەوە بزانین تێنەپەڕە یان تێپەڕ ، چونکە نیشانەی چاوگ پەیوەندیی بەمەوە نیە ·

١ ـ چاوگی تێنەپەڕ[1]

٢ ـ چاوگی تێپەڕ

لە هەموو زمانێکدا بەم جۆرەش لە زمانی کوردیدا چاوگ هەیە تێنەپەڕەو هەشە تێپەڕ ، هەردووك بە پێچەوانەی یەکدین هەروەك لە خوارەوە ڕوون دەکرێنەوە ·

### ١ ـ چاوگی تێنەپەڕ :[1]

چاوگی تێنەپەڕ بەو چاوگە دەگوترێت کە فرمانەکانی تەنیا

## چاوگی تێپەڕ :

دووبارە هەروەك چاوگی تێنەپەڕ هەیە چاوگــی تێپەڕیش هەیــە ٠

چاوگی تێپــەڕیش بەو چــاوگە دەگوترێت کــە فرمانەکەی باســی کارێك دەکات لە بکــەر و باسلێکراو دەچێتە دەرەوە بــۆ کەسێك یان شتێکی تر وەك :

من نامەم نووسی ٠

من چیم کرد ؟ نووسیم

چیم نووسی ؟ نامــە

---

کێ نامەی نووسی ؟ من

## تێبینی :

لە باسی فرماندا زیاتر ڕوونیان دەکەینەوە

نموونە بۆ چاوگی تێپەڕ :

١ ــ ڕشتن ، خستن ، شوشتن ، گەستن ، دەستکەوتن ٠

٢ ــ ناردن ، بژاردن ، ژماردن ، خواردن ، چاندن ، خوێندن

٣ ــ کێشان ، پێوان ، هێنان ، هەڵدان ، لێنان ٠

٤ ــ نووسین ، کڕین ، دڕین ، بڕین ، ماڵیین ، سڕیین ٠
چنین ، مژین ٠

٥ ــ دروون ، گروون ، بوون ، سوون ٠

ئەم چـاوگانە لەبەر ئەوەی لە ناو خۆیانـدا ، تێنەپـەڕ و تێپەڕن ، بەم جۆرەش لە ناو خۆیاندا هاوواتا و دژواتا دروست دەکەن ، بۆ نموونە :

| چاوگی تێنەپەڕ | (هاوواتا) | چاوگی تێپەڕ |
| --- | --- | --- |
| کەوتن | | خستن |
| نوستن | خەوتن | — |
| هاتن | — | هێنان× |
| چوون | ڕۆیشتن | ناردن ، بردن× |
| | | کێلان ، پێوان |
| دڕان | | دڕین |
| ڕژان | | ڕشتن |

| تێنەپەڕ | دژواتا | تێپەڕ |
| --- | --- | --- |
| هاتن | ڕۆیشتن | ڕۆیین |
| | دڕین | دروون |
| | بردن | هێنان |
| وەستان | دانیشتن | |
| هەڵستان | نوستن | |

دروستکردنی چاوگی تێپەڕ ، لە چاوگی تێنەپەڕ :

ئەو چاوگانەی لەسەرەوە باسمانکردن‌و لەگەڵ گەلێك چاوگی‌تر هەن ، کە یان تێنەپەڕ یان تێپەڕ ... وەك دەرکەوت بۆمان : هەن تێنەپەڕن‌و بەرانبەریان تێپەڕ هەیە، هەشن تەنیا یان تێنەپەڕ یان تێپەڕن . بەڵام زمان تەنیا بەوە ناوەستێت ، چونکە هەموو زمانێك شان‌بەشانی پەرەسەندنی کۆمـەڵ‌و پێویستییەکانی پەرە

دەستێنێتو نەشونما دەکات ، یەکێك لەو پەرەسەندنانە پێویستی بوونە بە گۆڕینی چاوگی تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ ، واتا دروستکردنی چاوگی تێپەڕ لە تێنەپەڕەوە ، بەو جۆرەش دروست کردنی چاوگی تێنەپەڕ ٠

## ١ ـ چۆنێتی گۆڕینی چاوگی تێنەپەڕ بۆ چاوگی تێپەڕ لە هەموو زمانێکدا

واتە لە هەر زمانێکی زیندوودا و هەر زمانەش بە پێی دەستوورو پەیڕەوی خۆی ئەمانەی تێدا دروست دەکرێت ، زمانی کوردیش دەستوور و بنکەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ دروست کردنی یان جێ بەجێ کردنی ئەم مەبەستە ٠ کە پاشان دێینە سەری ٠

لە سەرەوە گوتمان هەر چاوگێك ئەگەر تێنەپەڕ بوو ئەوە فرمانەکەشی تێنەپەڕە ، ئەگەر تێپەڕیش بوو ئەوە دیارە فرمانەکەی تێپەڕە ، بەم پێیەش هەر چاوگێك ئەگەر لە تێنەپەڕەوە کرا بەتێپەڕ ئەوا فرمانەکەشی دەبێت بە تێپەڕ ٠٠٠

بەڵام لەبەر ئەوەی تێپەڕ و تێنەپەڕی چاوگ لە گۆڕینەوەی فرمانەکەیدا دەردەکەوێت کاتی بەکارهێنانی لە ڕستەدا ، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەم گۆڕینە پەیوەندیی بە ڕەگی فرمانیشەوە هەیە ، بۆیە پاش باسکردنی فرمان و ڕوون کردنەوەی ڕەگەکەی و لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕ و تێپەڕ و باسکردنیان ، دێینە سەر چۆنێتی گۆڕینی تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ دوای ئەویش چۆنێتی دروستکردنی تێنەپەڕ ٠

## ( بەشی پێنجـــــــەم )

### باسی یەکەم :

### پێناسینی فرمان :

نیشانەی ڕووداوێکی کارێکە لە کاتێکی تایبەتیدا ، واتــە ڕوودانی فرمانەکە لە کاتێکی تایبەتیدا بە پێی پێویستی :

### باسی یەکەم ـ بناغەی فرمان :

فرمان بە پێچەوانەی چاوگ کــە تاقە یــەك بنکە هەیە بــۆ وەرگرتنی کە برێتییە لە :

چاوگ ـ نوونی چاوگ = بناغەی چاوگ •

واتە یەك بناغەی هەیە • بەڵام فرمان دوو بناغەی هەیە •

یەك : بناغەیێــك بۆ دروستکردنی کاتی ڕابــردوو و کە دووبارە برێتییە لە وەرگرتنی :

چاوگ ـ نوونی چــاوگ = بناغەی فرمان بۆ کاتی ڕابردوو •

چاوگ ـ نوونی چاوگ = بناغەی چاوگ

کەواتە : بناغەی چاوگ = بناغەی فرمان بۆ کاتی ڕابردوو

دوو : بناغــەی دووەم کە بۆ دروستکــردنی کاتی ئێستا و داهاتووە (×) ••• ئەم بناغەیە برێتییە لە ڕەگی فرمان •

### ٢ ـ باسی دووەم : ڕەگی فرمان :

لەبەر ئەوەی ناتوانین بەو جۆرەی کەرەگ‌و بناغەی چاوگی

(×) لە (ئەمر)یش •

پێ وەردەگرین ، ڕەگی فرمانیش بدۆزینەوە بۆیە چاکترین ڕێگە بۆ دۆزینەوەی ڕەگی فرمان ، گۆڕینـــەوەی فرمانەکەیە بۆ کاتی ئێستـــا ، واتە بەکـــار هێنانی ئەو فرمانەی مەبەستمانە لەکاتی ئێستادا • پاشان بە سەرنجدانی دەبینین بە ئامرازی (دە) دەست پێ دەکـات کـە پێی دەگوتـرێت ئامـــرازی کاتی ئێســـتا ••• هەروەها کۆتایی بە یەکێك لە راناوە کەسییە لکاوەکان دێت •• بە لادانی ئەو ئامراز و ڕاناوە ئەوەی دەمێنێتەوە پێی دەگوترێت ڕەگی فرمان ••• بۆ نموونە :

| ڕەگ | کاتی ئێستا | ڕەگ | نووسین ـ چاوگە |
|---|---|---|---|
| خەو | دە ـ خەوم | نووس | دە ـ نووسم |
| = | دە ـ خەویت | = | دە ـ نووسیت |
| = | دە ـ خەوێت | = | دە ـ نووسێت |
| = | دە ـ خەوین | ـ | دە ـ نووسین |
| = | دە ـ خەون | = | دە ـ نووسن |
| = | دە ـ خەون | = | دە ـ نووسن |

ئەگەر ســـەرنجی (نووس) و (خــەو) بدەین دەبینـــین تەنیا نیشانەی چاوگیان لێ لاچووە ••• سەرنج بدەن :

نووس + ین = نووسین = چاوگ •

خەو + تن = خەوتن = چاوگ •

( دە ) نەك تەنیا ئامرازی کاتی دروستبوونی رابوردووی

بەردەوامە(الماضی الاستمراری) لەهۆی بوونی ئەمتایبەتییە تێیدا وەك : دەچووم ، دەهات ، هەروەها نیشانەی هاندانە(تحریض) وەك : دەبڕۆ ، دەزووکە ، دەبیبڕەوە ، دەکەم ، لە سەری بڕۆ ــ واتە بۆجێبەجێکردنی کار زووبەزوو یانڕاگرتنو وازلێهێنان٠ هەروەها ناوی ژمارە (٣٠)شە ٠٠٠

ڕەگی چاوگیش پێكدێت بە لادانی نیشانەی چاوگ ، کەواتە : ڕەگی فرمان هەندێك جار = ڕەگی چاوگ ٠

گوتمان هەندێك جار نەك هەمیشە ٠ واتە ڕەگی فرمان دۆزینەوەی قورسە٠ بۆیە چاکترین ڕێگە ئەو ڕێگەیەی سەرەوەیە کە باسمانکرد ٠٠٠ بۆ نموونە سەرنجی خوارەوە بدەن :

| چاوگ | کاتی ئێستا | ڕەگی فرمان |
|---|---|---|
| ١ ــ سووتان ــ | دە ــ سووتێم = | سووتێ |
| ٢ ــ کێلان ــ | دە ــ کێلم = | کێل |
| ٣ ــ نوستن | دە ــ نوو ــ م = | نوو |
| ٤ ــ خەوتن | دە ــ خەو ــ م = | خەو |
| فرۆشتن | دە فرۆ ــ شم = | فرۆش |
| ٥ ــ کردن | دە ــ کە ــ م = | کە |
| ٦ ــ بردن | دە ــ بە ــ م = | بە |
| ٧ ــ مردن | دە ــ مر ــ م = | مر |
| ٨ ــ بڕین | دە ــ بڕ ــ م = | بڕ |
| ٩ ــ ناشتن | دە ــ نێژ ــ م = | نێژ |
| ١٠ــ خواستن | دە ــ خواز ــ م | خواز |
| ١١ــ پاراستن | دە ــ پارێز ــ م | پارێز |

| | | |
|---|---|---|
| کوشتن ـ | ده ـ کوژ ـ م = | کوژ |
| چه ندن ـ | ده ـ چێنم = | چێن |
| خوێندن ـ | ده ـ خوێنم = | خوێن |
| گه‌ستن ـ | ده ـ گه‌زم ـ | گه‌ز |
| مان ـ | ده ـ مێنم ـ | مێن |
| | ده ـ مێنم ـ | مینێ |
| ڕۆیشتن ـ | ده ـ ڕۆ ـ م ـ | ڕۆ |
| چوون ـ | ده ـ چم ـ | Gi |
| بوون ـ | ده ـ بم ـ | bi |
| گۆتن ـ | ده ـ خوێنم = | لێ |
| بینین ـ | ده ـ لێم | بین |
| گه‌یین ـ<br>گه‌یشتن ـ | ده ـ گه ـ م ـ | گه |
| ڕشتن ـ<br>ڕێشتن ـ | ده ـ ڕێژ ـ م ـ | ڕێژ |
| به‌ستن ـ | ده ـ به‌ستم ـ | به‌ست |
| هاتن | ده ـ هێم ـ دێم ـ | هێ |
| ڕێستن | ده‌ڕێسم | ڕێس |
| چاوگ ـ | کاتی ـ ئێستا | ره‌گی‌فرمان |
| پاراستن ـ | ده ـ پارێز ـ ن ـ | پارێز |

خواستن ــ ده ــ خوازــن ــ خواز

سپاردن ــ ده ــ سپێرــن ــ سپێر

کەواتە بە گشتی :

١ ــ چاوگە ئەلفییــە تێنەپەڕەکان ڕەگەکانیان بــەم جۆرە پێکدێت :

ا ــ چاوگ ــ نوونی چاوگ = بناغەی چاوگ

ڕژان ــ ن = ڕژا

ب ــ گۆڕینی پیتی ( أ ) لە بناغەی چاوگ بۆ (ێ) = ڕەگی فرمان

ڕژا ــ ڕژێ

بناغەی چاوگ ڕەگی فرمان

بەم جۆرە :

برژان ــ برژا ــ برژێ

خزان ــ خزا ــ خزێ

خنکان ــ خنکا ــ خنکێ

دڕان ــ دڕا ــ دڕێ

ئاوسان ــ ئاوسا ــ ئاوسێ

کوڵان ــ کوڵا ــ کوڵێ

بەڵام لە غەیری ئەلفیدا بە گشتی نەك هەمیشە دووبارە پیتی ( أ ) دەبێت بە (ێ) وەك :

ژماردن ــ ژمار ــ ژمێر

هاتن ــ ها ــ هێ

بژاردن ــ بژار ــ بژێر

چەندن ــ چەن

= چین

چاندن = چان

سپاردن ــ سپار ــ سپێر

پەساردن ــ پەسار ــ پەسێر  سەندن ــ سەن ــ سێن

٢ ــ هەروەها بە گشتی (س) دەبێت بە (ز) وەك :

| چاوگ ــ | رەگی چاوگ | = رەگی فرمان |
|---|---|---|
| خواستن | خواس | خواز |
| پاراستن | پاراس | پارێز |
| گەستن | گەس | گەز |

بەڵام :

رستن ــ رس

ریستن ــ ریس

ڕیس

نوستن ــ نوس ــ نوو

بەستن ــ بەس ــ بەست

٣ ــ هەروەها بە گشتی (ش)یش دەبێت بە (ژ) وەك:

| چاوگ | ڕەگی چاوگ | ڕەگی فرمان |
|---|---|---|
| کوشتن | کوش | کوژ |
| ناشتن | ناش | نێژ |
| رشتن | رش | ڕێژ |
| ڕێشتن | ڕێش | |
| کرۆشتن | کرۆش | کرۆژ |

بەڵام :

فرۆشتن ــ فرۆش ــ فرۆش

٤ ــ هەندێك جار ڕەگی فرمان = بناغەی چاوگ ، وەك :

بەستن ــ ن = بەست   بناغەی چاوگ

دە ــ بەستم ــ بەست = ڕەگی فرمان

٥ ــ هەندێك جار :

کردن ــ کر ــ کە

بردن ــ بر ــ بە

خستن ــ خس ــ خە

٦ ــ دوو چاوگ بە یەك ڕەگی فرمان :

گەیشتن

گەیین   گە

ڕۆیشتن

ڕۆیین   ڕۆ

٧ ــ دیتن

بینین   بین

٨ ــ پەیوەندی بە پیتەکانی چاوگەکەوە نیە :

کوشتن ــ کوژ ــ تێ

بەڵام بە گشتی ئەگەر سەرنجی ئەم ڕەگانە بدەین دەبینین دەکرێن بە سێ بەشەوە ، یان لە سێ بنکەدا کۆدەکرێنەوە :

**١ ــ بنکەی تەواو :**

ڕەگی چاوگ = ڕەگی فرمان

نووسین ــ نووس ــ نووس

فرۆشتن ــ فرۆش ــ فرۆش

بڕین ــ دڕ ــ دڕ

دڕین ــ بڕ ــ بڕ

کەوتن ــ کەو ــ کەو

خەوتن ــ خەو ــ خەو

کێڵان ــ کێڵ ــ کێڵ

پێوان ــ پێو ــ پێو

دۆزین ــ دۆز ــ دۆز

**٢ ــ گۆڕینی پیتێك بە پیتێکیتر ، وەك :**

دوو جۆرە :

ا ــ بۆ ــ ێ

س ــ بۆ ــ ز

ش ــ بۆ ــ ژ

بژاردن ــ بژار ــ بژێر

ژماردن ــ ژمار ــ ژمێر

ناردن ــ نار ــ نێر

ا ــ لادانی نیشانەو گۆڕینی ( ا ) بۆ (ێ) ٠

ب ــ لادانی (ن) و گۆڕینی (ا ) بۆ (ێ) ی چاوگە ئەلفیەکان ٠

رەگی چاوگ = رەگی فرمان

تەنیا جیاوازی گۆڕینی (ش) بۆ (ژ) ٠

کوشتن ــ کوش ــ کوژ

کرۆشتن ــ کرۆش ــ کرۆژ

(س) بۆ (ز)

خواستن ــ خواس ــ خواز

ڕەگی چاوگ = ڕەگی فرمان

تەنیا جیاوازی گۆڕینی (س) بۆ (ز) ٠

ناردن ــ نار ــ نێر

**٣ ــ بناغەی چاوگ = ڕەگی فرمان ، ئەم زۆر کەمە ، وەك :**

بەستن ــ بەست      بناغەی چاوگ و ڕەگی فرمان

**٤ ــ گۆڕینی دوا پیتی ڕەگی چاوگ بە ( ە ) :**

کردن ــ کر ــ کە

بردن ــ بر ــ بە

خستن ــ خس ــ خە

٥ ــ ئەوانەی هاومەبەستیان هەیە بەڵام بە هەردووك یەك ڕەگ :

دیتن

بین

بینین

گەیشتن

گە

گەیین

ڕۆیشتن

رۆ

ڕۆین

لەوانەیە (گەیین) و (ڕۆین) بنج بن ٠

**٦ ـ ئەوانەی ڕەگەکانیان پێوەندییان بە چاوگەکەوە نیە ، وەك :**

**گوتن ـ لێ**

دیتن ـ بین (بینین)

**ڕاهێنان :**

هەر یەکە دەتوانێت بەپێی نیشانەکانی چاوگ ژمارەییێکی باش بهێنێتەوە ، بۆ تاقیکردنەوە لە تێنەپەڕ و تێپەڕ پاشان سەرنجی ڕەگی هەر یەکە بدات پاش گۆڕینەوەی بۆ کاتی ئێستاو جوداکردنەوەی لە نیشانەی کاتی ئێستا و ڕاناوی کەسیی لکاو ٠

**تێبینی :**

گۆڕینەوەی بۆ تەنیا یەك کەس بەسە، وەك بۆ کەسی یەکەمی یەکەمی تاك بۆ نموونە ٠

**٣ ـ باسی سێیەم :**

جیاوازیی نێوانی ڕەگ و بناغەی چاوگ و فرمان پاش ڕوون کردنەوەی ڕەگی فرمان و چاوگ ، هەروەها بناغەی فرمانو چاوگ ٠ بۆمان دەرکەوت کە تەنیا یەك بنکە هەیە بۆ وەرگرتنی بناغەی چاوگ :

چاوگ ـ ن =

هەروەها تەنیا یەك بنکە هەیە بۆ وەرگرتنی بناغەی چاوگ

چاوگ ـ نیشانەی چاوگ ٠

واته یەك ڕەگێ و یەك بناغە هەیە •

بەڵام لە بنکەیێك زیاتر هەیە بۆ وەرگرتنی ڕەگی فرمان ، هەرچەندە ئەو بنکەیەش بە ئاسانی لەبەر ناكرێت ••• بەڵكو پاش ڕاهاتنێكی باش و شارەزایی پەیدا كردن ئینجا دەگەین بەو بنكانەی بە پێی ڕەگی فرمانەكان دەناسین• بگەڕێنەوە بۆ باسەكە یان خۆتان هەوڵی نموونەی تازەبدەن بۆی •

**بناغەی فرمان :**

دوو بناغە هەیە :

یەك ــ بناغەی كاتی ڕابردوو •

بناغەی كاتی ئێستا و داهاتوو •

بەڵام لەگەڵ بوونی جیاوازیدا پەیوەندیش هەیە چونكە سەرچاوەی فرمان چاوگە لەم زمانەدا لەو پەیوەندیانە :

ڕەگی چاوك = ڕەگی فرمان •

یەكسەر بەگۆڕینی پیتێك بەپیتێك هەروەها ــ ئەمریش دەگرێتەوە •

**ڕاهێنان**

١ ــ بۆچی لە چاوگەوە دەست پێ دەكەین پێش هاتنە سەر فرمان ؟

٢ ــ چاوگ بە پێیی كاری (تأثیر) چەند بەشە وچۆن دەزانین ؟

٣ ــ فرمان چیە ؟ پێناسینی گشتی و تایبەتیی ڕوون بكەرەوە ؟

٤ ــ جیاوازیی نێوانی چاوگ وفرمانچیە؟ ئەی پەیوەندییان؟

٥ ــ فرمان چەند جۆرە بە پێی كاری ؟

٦ ــ بناغەی فرمان چیە و چۆن پێك دێت ؟ بەراوردیی بكە لەگەڵ

بناغەی چاوگدا بە نمونەوە ؟

٧ ــ ڕەگی فرمان چۆن دەدۆزینەوە و ئەو ڕەگانە بەپێی ئەو ئاڵوگۆڕەی بەسەریاندا دێت چیە ؟ ڕوونیا بکەرەوە ؟

٨ ــ هەڵەکردن لە ڕەگی فرمـان و تێکـەڵکردنی لەگەڵ ڕەگی چـاوگدا تووشی چیماندەکـا ؟ بۆ ئەمـەبگەڕێنەوە سـەر هەر سەرچاوەیێک کە ئەم باسەی تێدایە و هەوڵی وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە بدەنەوە ٠

٩ ــ چ جیاوازیێك هـەیە لە نێوانی ڕەگی فرمانی چاوگە ئەلفیە تێنەپەڕەکان و ئەوانیتر ؟

١٠ ــ هەر یەکـە لیستەیێك بکات بۆ ڕەگی ئەو فرمانانەی لێرەدا باس نەکراونوڕوونیان بکاتەوە و بزانێت دەچێتە ژێر کام بەش؟

١١ ــ هەر یەکە لیستەیێك بکاتبۆچاوگ ٠

١ ــ بۆ تێپەڕ و تێنەپەڕ ٠

٢ ــ بۆ هاومەبەستەکان ٠

٣ ــ بۆ دژواتاکان ٠ لەوانەی کە لەباسەکەدا نین ٠

باسەکەدا نین ٠

## باسی چوارەم و باسی پێنجەم

## فرمانی تێنەپەڕ و فرمانی تێپەڕ :

لە باسی چاوگی تێنەپەڕدا گوتمان کە چاوگ هەیە تێنەپەڕ و هەیە تێپەڕ ٠

چاوگیش هەیە تێنەپەڕە بەڵام پێویستی هەیە بە گۆڕینی لە تێنەپەڕەوە بۆ تێپەڕ ٠

بەڵام لە ڕێی هەر چاوگەوە دەزانین کە فرمانە تێنەپەڕە یان تێپەڕە واتە ـ ئەگەر چاوگەکە تێنەپەڕ بوو فرمانەکەی تێپەڕەو ئەگەر تێپەڕ بوو فرمانەکەی تێپەڕەو ئەگەر لە تێنەپەڕەوە کرا بە تێپەڕ فرمانەکەش لە تێنەپەڕەوە دەبێت بە تێپەڕ ٠

ئەو فرمانانـەی خۆیان لــە خۆیاندا تێنەپــەڕ و تێپەڕیان هەیە ٠٠٠ بنجین ٠

وە ئەوانەی پێویستی هەیە بە گۆڕینیان لەتێنەپەڕە بۆ تێپەڕ پێیان دەگوترێت دروست کراو ٠٠٠

## ٧ ـ باسی شەشەم ـ گۆڕینی تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ : ـ

ئێستا با بێنە سەر چۆنیتی ئەم دروستکردنە و بپرسین ئایا ڕێو شوێنێکی تایبەتی یان دەستوورێکی ڕێکوپێك هەیە بۆ ئەم گۆڕینە یان نا ؟ لە وەڵامدا دەڵێین بەڵێ ٠٠٠ هەروەك لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە ٠٠٠ بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی پێشتر باسمان کردوون لەبەرئەوەی هەندێکیان بەیارمەتی ڕەگی فرمان دەکرێت بەتێپەڕ وە زۆر لەو ڕەگــانە بە ئاسانی ســەرچاوەی فرمانەکە کە چاوگە دەرناخەن بۆیە چاوگە تێنەپەڕە وەردەگرینو دەیکەین بە تێپەڕ بەپێی ئەو ڕێبازەی هەیە کە بریتیە لە ٠

وەرگرتنی ، یان ٠

ا ـ بناغەی چاوگ

ب ـ ڕەگی چاوگ ـ تێنەپەڕ + پاشگری (اندن)=چاوگی تێپەڕ

ج ـ ڕەگی فرمان

چاوگه واویەکان بناغەی وەردەگیرێت :

ا ـ چوون ـ ن = چوو = بناغەی

چوو + اندن = چوواندن = تێپەڕ

بوون ـ ن = بوو = بناغەی چاوگ

بوو + اندن = بوواندن

درووون ـ ن = دروو

دروو + اندن = درواندن

ب ـ کەوتن ـ تن = کەو = ڕەگی چاوگ و فرمان

خەوتن ـ تن = خەو = ڕەگی چاوگ و فرمان

+ اندن = کەواندن(١) و خەواندن = تێپەڕ

بەزین ـ ین = بەز = بەزاندن

پەڕین ـ پەڕ + اندن = پەڕاندن

کولاَن ـ کولَ + اندن = کولاَندن

سووتان(١) ـ سووت + اندن = سووتاندن

تاسان ـ تاس + اندن = تاساندن

مردن ـ مر + اندن = مراندن

دوان ـ دو + اندن = دواندن

ج ـ نوستن ـ نوو + اندن = نوواندن

نوواندن خەواندن خۆدەرخستن

کەواتە تاقـە یەك بنکە هەیە بۆ گۆڕینی چـاوگ و فرمانی تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ ئەویش پێك دێت لە :

وەرگرتنی ڕەگ و بناغەی چاوگ و فرمان
+ پاشگری (اندن) = تێپەڕ

هەروەها تاقە یەك پاشگر هەیە بۆ گۆڕینی ئەم چاوگە و فرمانە تێنەپەڕانە ئەویش پاشگری (اندن)ە ٠

بەمە ژمارەی چاوگە تێنەپەڕەکان زیاد دەکەن و هەروەها بەمەش ژمارەی چاوگە دالیە تێپەڕەکان زیاد دەکات و دەچێتە ڕیزی چاوگە دالیە بنجیە تێپەڕەکان ٠

کەواتە :




**ڕاهاتن**

١ ــ هەوڵ بدەن ژمارەیێکی باش لە چاوگە تێنەپەڕەکان کۆبکەنەوە و پاشان هەر یەکە بکەن بە تێپەڕ بەپێی بنکەی سەرەوە ٠

٢ ــ ئەو چاوگانە دەست نیشان بکە کە تێنەپەڕن بەڵام ناکرێت بەتێنەپەڕ بەڵگەت چیە و بۆی ؟ ٠

٣ ــ بەرانبەر بەو تێنەپەڕانە ئەوەندە چاوگە بهێنەوە و دەری بخە :

أ ــ کامیان تێپەڕی هەیە لەبنجدا ٠

ب ــ کامیان هەر تێپەڕە و تێنەپەڕی نیە ٠ دووبارە دەری بخە بەڵگەت چیە و بۆ ؟

**پاشگری ئاندن**

تائێستا ئەوەندەمان زانی دەربارەی پاشگری (ئاندن) کەتاقە پاشگــرە و دەورێکی بالآی هــەیە لە گۆڕینی چــاوگ و فرمانی تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ ۰

٣ ـ بەڵام پاشگری ئاندن سەرەڕای ئەم دەورە بالآیەی ، دەوریشی هەیە لە دروست کردنی هاومەبەست بۆ ئەو چاوگانەی کە خۆیان لە خۆیاندا تێنەپەڕن بۆ نموونە :

ڕژان ـ ڕشتی ـ ڕژاندن

دڕان ـ دڕین ـ دڕاندن

کەوتن ـ خستی ـ کەواندن

لە هەر یەکەدا یەکەم‌و دووەم هاومەبەستن بەڵام تێنەپەڕ و



تێپەڕن ـ دووەم و سێیەم هاوەبەستن و تێنەپەڕن •

بەمە ژمارەی ئەو چاوگە تێپەڕانەش زیاد دەکەن کە تێنەپەڕیان بەپێی ژمارەی دروست کردنی چاوگی تێپەڕی هاوەبەست بۆیان بە مەش ئەمانە دەچنەپاڵ ئەو چاوگە تێپەڕانەی کە تێپەڕیان نیە لە بنجدا •

٣ ـ پاشگری (ئاندن) و دروست کردنی واتای نوێ لەپاڵ دروست کردنی تێپەڕدا وەك :



٤ ـ دروستکردنی چاوگی تێنەپەڕ و پاشگری (اندن) :

پاشگری (اندن) هەر وەك تێپەڕ دروست دەكات ، تێنەپەڕیش پێك دەهێنێت ، بەم شێوەیەی خوارەوە :

ناوی دەنگی سروشتی + پاشگری (اندن) = چاوگی تێنەپەڕ

لوورە + اندن = لووراندن

هەروەها :

گرمە + اندن = گرماندن

هاژە + اندن = هاژاندن

جیکە + اندن = جیکاندن

باعه + اندن = باعاندن

قیژه + اندن = قیژاندن

قیره + اندن = قیراندن

... هتد .

**تێبینی :**

١ ــ ( ه ) له ناوی دەنگە سروشتییە و ( ا ) له (اندن)دا یەك دەخرێن لەبەر قورسی (ادغامکردن) .

٢ ــ ناوی دەنگ جۆرە بەشێکی ناوی دەنگی سروشتییە و بەم جۆرە ناکرێن بە تێنەپەڕ وەك :

هاڕەهاڕ = (هاڕاندن) تێپەڕ ، (هاڕین) تێنەپەڕ

تەقەتەق = (تەقاندن) تێپەڕ ، (تەقین) تێنەپەڕ

تەپەتەپ = (تەپاندن) تێپەڕ ، (تەپین) تێنەپەڕ

گریە(١) = (گریاندن) تێپەڕ ، (گرین و گریان) تێنەپەڕ

٣ ــ (اندن) ئەگەر چووە سەر ناوی دەنگی سروشتی دەیکات بە فرمانی تێنەپەڕ لە ناوەوە ، ئەگەر وشە چاوگی تێنەپەڕ بوو دەیکات بە تێپەڕ ، ئەگەر تێپەڕ واتا و مەبەستی تازەی لێ دروست دەکات .

کەواتە بە یاریدەی پاشگری (اندن) و ناوی دەنگی سروشتی ژمارەی چاوگە تێنەپەڕەکان زیاد دەکات و دەچێتە پاڵ چاوگە تێنەپەڕە بنجییەکان، بەڵام دروستکراوەکان بە نیشانەی چاوگ (دن) کۆتاییان دێت ، واتە دەبن بە چاوگی (دالی) بەڵام چاوگی (دالی)ی تێنەپەڕی بنجی بە گشتی کەمە .

کەواتە بەم شێوەیە ئەو ناوانە دەبن بە چاوگ و فرمانەکانیان وەك هەر فرمانێکی‌تر بە ئاسانی و بە پێی کات و پێویست دەگۆڕڕینەوە .




١ ـ ژمارەیێکی باش لە چاوگە تێنەپەڕە بنجییەکان بنووسە •

٢ ـ ژمارەیێکی باش لە ناوی دەنگی سروشتی بکە بە چاوگی تێنەپەڕ و بزانە چەند تێنەپەڕی تازەت خستە پاڵ تێنەپەڕە بنجییەکان •

٣ ـ بەراوردیی هەردوو لایان بکە لەگەڵ یەك و پەیوەندی و جیاوازییان دەربخە •

کەواتە :

پاشگری (اندن) وەك دەرکەوت پاشگرێکی فرمانییە ••••

چونکە دەچێتە سەر وشە :

یەکەم ـ ئەگەر ناو بوو دەیکات بە چاوگی تێنەپەڕ •

دووە ـ ئەگەر چاوگی تێنەپەڕ بوو دەیکات بە چاوگی تێپەڕ •

**ڕاهێنان :**

١ ـ چەند جۆرە چاوگ و فرمان هەیە بە پێی کاریان ؟ ئایا هەموو یەکن بە پێی دەرکەوتن یان نا ؟ ڕوونیان بکەرەوە •

٢ ـ چۆن تێنەپەڕ دەکرێت بە تێپەڕ ؟

٣ ـ چۆن تێنەپەڕ دروست دەکرێت و لە چی ؟

ئەم تێنەپەڕ و تێپەڕە دروستکراوانە پەیوەندییان چیە بە یەکەوە و جیاوازییان لەگەڵ تێنەپەڕ و تێپەڕە بنجییەکاندا چیە ؟

٤ ـ پەیوەندیی تێوانی پاشگری (اندن) و نیشانەی چاوگی ئەو فرمانانە چییە کە (اندن) وەردەگرن ؟

٥ ـ ڕەگی فرمانە دروستکراوەکان چۆن پێكدێنو جیاوازییان

چیه لە رەگی فرمانە بنجییەکان ·

٦ ـ پاشگری (اندن) چ دەورێکی هەیە لە فراوانکردنی زمان و وشەسازی و ڕێزماندا و چ کەلێنێکی پڕکردۆتەوە ؟

٧ ـ بگەڕێنەوە بۆ چەند سەرچاوەیێك کە باسی ئەم پاشگرەی تێدایە ، لە ڕووی ڕواڵەت و ناوەڕۆکەوە لەگەڵ ئەم باسەدا بەراوردیی بکە و ئەنجام بدەن بە دەستەوە(١) ·

## باسی حەوتەم و باسی هەشتەم

## فرمانی سادە و ناسادە

دووبارە لەبەر ئەوەی فرمان لە چاوگ وەردەگرین و چاوگ چۆن و چی بوو فرمانەکەی وەها دەبێت ··· واتە ئەگەر چاوگەکە سادەبوو دیارە فرمانەکەشی سادەیە و ئەگەر چاوگەکە ناسادە بوو دیارە فرمانەکەشی ناسادەیە ·

کەواتە با بزانین چاوگ و فرمان بە پێی ڕواڵەتی دەکرێت بە چەند بەشەوە و ئەو بەشانەش چۆن دروست دەبن ·

پێش ئەوەی باسی ڕواڵەتی چاوگ و فرمان بکەین پێویستە بزانین کە ئەم باسە لقێکە لە باسی وشەی سادە و ناسادە و چاوگ و فرمانی سادە و ناسادە دەچێتە ژێر ئەو بەشە فراوانە کە پێی دەگوترێت وشە بە پێی ڕواڵەت و پێکهاتنی ، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنیا باسی چاوگ و فرمان دەکەین لەم ڕووەوە چونکە هەر کۆمەڵە وشەیێك پێناسین و پێکهاتنی تایبەتی خۆی هەیە هەرچەندە پێوەندیش هەیە لە نێوانیاندا ·

### چاوگ و فرمان بە پێی ڕواڵەت و پێکهاتن «البنية»

چاوگ بە پێی ڕواڵەت دەبێت بە سێ بەشەوە :

١ ـ چاوگی سادە ·

٢ ـ چاوگی دروستکراو (داڕێژراو) ·

٣ ـ چاوگی لێکدراو ·

یان دەتوانین بڵێین :

١ ــ سادە ٠

٢ ــ (داڕێژراو) دروستکراو ٠

٣ ــ لێکدراو(١) ٠

**١ ــ چاوگ (فرمان)ی سادە :**

چاوگ وشەیە ، وشەی سادەش لــە تاقە وشەیێك پێك دێت کەواتە ، چاوگ و فرمانی سادە بە گشت ئەوانە دەگوترێت کە لە تاقە یەك چاوگ یــان یەك فرمان پێکهاتوون ، تێنەپــەڕبن یان تێپەڕ ئەمانەش بــە گشــتی ئەوانــەن کە بنجــین و بــەو جۆرە هاتوونەتە کایەوە وەك :

کڕین ، بڕین ، دڕین ، نوستن ، کەوتن ، ناشتن ، ڕشتن ، هاتن ، چــوون ، درون ، خواردن ، ناردن ، مــردن ، نووسین ، تۆقین ، تەقین ، کشان ، ڕژان ، ئاوسان ، هێنان ٠٠٠ هتد ٠

٢ ــ ناسادە ئەوانــەن کە لە وشەیێك زیاتــر پێکهاتوون ، بەڵام گشت وشەکان چاوگ یان فرمان نین ، بەڵکو تەنیا لە یەك چاوگ یان یەك فرمان پێك دێت ، واتە نابێت چاوگێك زیاتری تێدا هەبێت ، بەڵام دەگونجێت وشەیێکی یان ئافیکسێکی(٢) زیاتر تێدا هەبێت ٠ ب

بۆ ڕوونکردنــەوەی زیاتــر ناســادە دەکەینــەوە بــە دوو بەشەوە و هەر یەکە بە تەنیا باس دەکەین :

١ ــ دروستکراو (داڕێژراو) ٠

٢ ــ لێکدراو ٠

**١ ــ دروستکراو :**

بەو چــاوگ و فرمانانە دەگوتــرێت کە لەگــەڵ ئافیکس(١) (پێشگر و پاشگر) پێكدێن ٠

واتە ــ پێشــگر + چاوگ و فرمــان = چــاوگ و فرمانی

دروستکراو ·

چاوگ و فرمان + پاشگر = چاوگ و فرمانی دروستکراو ·

پێشگر و پاشگر + چاوگ و فرمان = چاوگ و فرمانی دروستکراو ·

مەرج نیە تەنیا یەك پێشگر یان یەك پاشگر بە تەنیا بچێتە سەر فرمانەکە ·· مەرجیش نیە پێشگر یان پاشگر بە تەنیا بچێتە سەر فرمانەکە بەڵکو بە پێی پێویست دروست دەبێت ، بەڵام مەرجە لە تاقە یەك چاوگ و فرمان پێك بێت ·

بەڵام پێویستە ئەو پێشگر و پاشگرانە بناسین هەروەها پێویستە بشزانین کە پێشگر لەگەڵ فرماندا و پاشگر لەگەڵ ناودا زیاتر بەکار دێت ·· هەرچەندە ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە پێشگر لەگەڵ ناو و پاشگر لەگەڵ فرماندا بەکار نایێت(١) ·

**٢ ـ لێکدراو :**

ئەوانەن کە لە چاوگ و فرمانێك + وشەیێك یان زیاتر پێك دێن ·

بەڵام هەمیشە فرمان دەکەوێتە دواوە و لە فرمانێك یان چاوگێك زیاتر نابێت هەبێت ، بەڵام دەگونجێت لە وشەیێکی زیاتر لەگەڵدا بێت ·

لەوانەیە بڵێن کەواتە بۆچی پێی دەگوترێت فرمانی نسادە ، یان بۆچی ناوەکە بۆ فرمانەکەیە نەك بۆ ئەو وشانە ؟ لە وەڵامدا دەڵێین چونکە فرمان دەگۆڕرێتەوە و دەوری ئەو وشانە و واتا تازەکانیان دەخاتە ڕوو و ئەوان وەك خۆیان دەمێننەوە هەرچەندە بەبێ ئەوان ئەو واتا تازانە دروست نابن ·

**فرمانی نسادە :**

گوتمان لە یاریدەی فرمانێك یەکێك یان زیاتر لە وشەکانی

تر دروست دەبێت ، وشەش ئەمانەن :

١ ــ ناو ٠

٢ ــ ئاوەڵناو

٣ ــ ڕاناو

٤ ــ فرمان

٥ ــ ئاوەلکار

٦ ــ ناوی ژمارە

٧ ــ ئامراز ٠

هەوڵ دەدەین کە دەوری هەر یەکە لەمانە دەربخەین و بزانین کامیان دەوریان بنجن یان لەوانی‌تر گرنگترە لەم کارەدا ٠

هەروەها هەاڵی ئەوە دەدەین بە تەواوی فرمانە لێکدراوەکان بخەینە ڕوو و لەو وشانە جودایان کەینەوە کە بە هەڵە بە فرمانی لێکدراو دانراون ، هەروەها هەر کۆمەڵە فرمانێکی لێکدراو لەوی تر جودا بکەینەوە بە وردی‌و بە نموونە لەگەڵ جۆری داڕشتنیان٠

## نموونە بۆ چاوگ‌و فرمانی دروستکراو
## (بە یاریدەی پێشگرو پاشگر)

**یەکەم :**

**پێشگر و فرمان ٠**

پێشگر دەورێکی باڵای هەیە لە دروستکردنی دەیەها چاوگ و فرمانی ناسادەی دروست کــراو کە دەبنە هۆی دروست بوونی دەیەها واتاو مەبەستی نوێ کە لەناو خۆیاندا ــەوانیش هاوواتاو دژواتا دروست دەکــەن و فراوانی و پەرەســەندن دەبەخشن بە زمانەکە و ناسك و ئاسانی دەکەن لە دەربڕیندا و دروستکردنی ڕستەدا ٠

ژمارەیێکی باش لە پشێگر هەیە لەم زمانەداو پێشگر بەگشتی‌و بە پێچەوانەی پاشگر لەگەڵ فرمان زۆرتر بەکاردێن وەك لە ناو

• • • بەلاَم هەندێك کۆمەڵە وشـەێکیان خستۆتە پاڵ پێشگر بێ ئەوەی هیچ پێوندییان پێکەوە هەبێت هەر یەکە بە تەنیا •

بە کورتی دەڵێین : وشە = واتا ، کۆمەڵە دەنگێکی واتادارو ئەوانەن لەپێشەوە باسمان کردووە ، بەلاَم پێشگرو پاشگر وشە نین و بەشێك نین لە بەشەکانی ئاخافتن بەڵکو جاران وشە بوون بەلاَم بە تێپەڕبوونی کات و پەرە سەندنی کۆمەڵ ئەمانە لە وشەیی شۆراون و بوون بە خاوەن خاسیەتێکی تازە بۆیە ئەم زاراوەیە تازەیـــان بۆ دانراوە ئەمڕۆ ، کــەواتە پێشگر و پاشگر ئـــەمڕۆ ئەوانەن کــە بە تەنیـــا واتا نابــەخشن بەلاَم بە چوونە پاڵ وشە واتاکان سەر هەڵدەداتەوە • •

## پێشگر و چاوگ و فرمان

### پێشگر و چاوگ و فرمان

١ ـ هەڵ ، بە گشتی واتای بەرزیو بۆ سەرەوەیە :

هەڵکردن ، هەڵگرتن ، هەڵواســین ، هەڵــدان ، هەڵماڵین ، هەڵکەندن ، هەڵخستن ، هەڵدڕین ، هەڵگلۆفتن ، هەڵمژین ، هەڵتۆقین ، هەڵسووڕان هەڵســتان ، هەڵبوون ، هەڵچەقین ، هتد • • •

بۆ نموونە :

جۆ بە دیوارا هەڵئەگێڕێ (هەڵگێڕان) •

ڕیش نەبێ بە ڕیشەوە کە بوو ئەبێ شانەی بۆ هەڵگری •

شەوو ڕۆژ لە هەڵسووڕان و داسووڕاندایە •

**٢ ـ دا ـ بە گشتی واتای بۆ خوارەوەیە بە پێچەوانەی هەڵ :**

دانیشتن ، داماڵیـــین ، دادڕیـــن ، دابەزیـــن ، داپڵۆخـــان ، داکەوتن ، داچڵەکین ، داڕزین ، داتەپین ، داخستن ، دامرکان ، دانان ، داچەقین ، دابەستن ... هتد ·

**بۆ نموونە :**

نامەی جوانیم پیری دایدڕی ·

سواربوون عەیبێکە و دابەزین دوو عەیب ·

لە دەنگم دانەچڵەکێ دوێنێ شەو هاتە خەوم ·

بە جارێك داتەپیوە و داکەوتووە ·

**٣ ـ ڕا ـ بزووتنەوەیێکی ڕاستەوخۆ پیشان دەدات بە گشتی :**

ڕاکـــردن (هـــەڕڕاکـــردن) ، ڕاخســـتن ، ڕاپـــەڕین ، ڕاماڵیین ، ڕابوون (هەڵستان) ، ڕاچڵەکین ، ڕاگرتن ، ڕابواردن، ڕاکێشان ، ڕادان ، ڕاهاتن ، ڕاوەستان ڕاهێنان ، ڕاچەنین هتد ·

**بۆ نمونە :**

بە ڕاکردنڕۆی ·

پێ بەقەد بەڕەی خۆت ڕاخە ·

بە هیچ جۆرێك ڕانەوەستیت و زوو بگەڕێیتەوە ·

کارەساتی زەمانە باش ڕای هێناوە ·

ماوەییکی خۆشمان پێکەوە ڕابوارد (بردەسەر) ·

بە ڕاکێش ڕاکێش گەیاندمە ئێرە ·

**٤ ـ وەر ـ بەگشتی گەڕانەوەو شوێنگۆڕین دەردەخات ، ئەمە**

**پێشگرو پاشگره (تانیکس)ە لەگەڵ ناونا زیاتر بەکاردێت :**

وەرگەڕان ، وەرچەرخان ، وەردان ، وەرگرتن ،

**بۆ نمونە ·**

پاش شتن دوو سێجار ئاوم تێوەردا ·

له یاری کردندا لاقی وەرگەڕا ·

پەیامەکەم وەرگرت ·

توند وەری گێڕا بۆیه شکا ·

**٥ ـ لێ ، ژێ ـ هاومەبەستن :**

**وەك :**

لێدان ، لێگرتن ، لێبوردن ، لێکەوتن ، لێسەندن ، لێگەڕان ، لێخستن ·

ـ لێی گەڕێن با بە ئارەزووی خۆی بیکات ·

ـلێی ببووره دنیا ئەوەندە ناهێنێت ·

ـلێی ناگرێت دەزانێت هیچی له دڵدا نیه ·

ـلێکەوتەیە دڵی ڕابگرن ·

**٦ ـ تێ ، جووله بۆ ناوەوه پیشان دەدات به گشتی :**

تێکردن ، تێکەوتن ، تێپەڕین ، تێخزین ، تێنیشتن ، تێگەیین (تێگەیشتن) ، تێوەردان ·

تێوەردان ·

بۆ نمونه :

ـ ئەوەی چاڵ بۆ یەکێ هەڵکەنێ خۆی تێی ئەکەوێ ·

نانەکەیان بۆ تێکە تا سارد نەبۆتەوە ٠

باش تێیگەیشتووم و لەوسەرەوە هاتوومەتەوە ٠

کە بەوێدا تێپەڕین سەرێکیان لێ بدەن ٠

**٧ ـ لێك ، لە (لە یەك) پێکهاتووە :**

لێکردن ، لێکدان ، لێکنان ، لێکخستن ، لێککەوتن ، لێکبوون هتد ٠

پێش نەختێك چاوی لێك نا ٠

پاش لێکبوون (لەیەك بوون) ٠

هەر لێك نەکەون باشە ٠

هاوڕێ لێککردن کارێکی زۆر ناپەسەند و نابەجێیە ٠

**٨ ـ تێك دژی (ڕێکخستن)ە لە واتا :**

تێکدان ، تێکنیشتن ، تێك ئالآن ، تێكوروژان ، تێکچوون ، تێکشکان ٠ هتد ٠

بۆ نمونە :

ڕەنگە تێکچووبێ بەجارێ ڕەحمو ئینسافی بەشەر
یا فراری کردبێ لای ئێمە دەرچوویێتە دەر ٠

لەشکری دوژمن چاك تێکشکان ٠

بە جۆرێك تێكوروژاون مەگەر هەر خوا بزانێت چۆن ٠

وازیان نەهێنا تا پێیان تێکدا ٠

**٩ ـ پێك ـ کەم بەکار دێت نزیکبوونەوە عەکسی لێك بە گشتی :**

پێکهاتن ، پێکهێنان ، پێکهاوردن ٠٠٠٠ هتد ٠

بۆ نموونه :

- به هیممه‌تی دڵسۆزان پێکهاتنه‌وه (ئاشتبوونه‌وه) ·
- پێکیان هاوردنه‌وه (پێکیان هێناوه‌ته‌وه) ·

**١٠- پێ - واتای نوێ دروست ده‌کات و بۆ واسیطه‌ش به‌کار دێت ، یه‌که‌م له‌گه‌ڵ وشه‌که‌دا ده‌نووسرێت ، دووه‌م به جودا چونکه واتا ناگۆڕێت :**

پێکرن (هه‌ڵکردن) ، پێبردن ، پێگه‌یشتن ، پێگه‌یاندن (گه‌وره کردن) ، پێبڕین ·

**بۆ نموونه :**

- چراکان پێمه‌که (دامه‌گیرسێنه) هێشتا زووه ·
- له شوێنێکم داناوه که‌س ڕێی پێ نابات (نایدۆزێته‌وه) ·
- میوه‌کان ماوه‌یێکه پێگه‌یشتوون ·
- ژیانی خۆی له‌سه‌ر دانا تا پێی گه‌یاند ، به‌ڵام ڕه‌نجی به زایع نه‌چوو ·
- ئه‌و هه‌موو ڕاکه‌ڕاکه‌یه و هیچیشی پێ نه‌بڕرا ·

پێ کردن (به ئه‌و + کردن) ، پێ گوتن ، پێ بڕین ، پێ هاتن ·

**١١- پێدا - لێکدراوه (پێ + دا) یه پێ - دا :**

پێداگه‌یشتن ، پێداکردن ، پێداهێنان (پێداهاوردن) ، پێداهاتن ·

- زوو نه‌ڕۆیشتمایه پێدا نه‌ده‌گه‌یشتم ·

ناوی خودای لێ بهێنه و ئاوێکی پێدا بکه ·

ــ که بەوێدا هاتن منتان له بیر نەچێت ·

لەناو ڕستەدا شی دەبێتەوە به پێی شوێن و مەبەست (بەوێدا هاتم ــ پێیدا هاتم) ·

پێ ــ دا ، پێ ــ داکردن ، پێ ــ داهێنان ، پێ ــ داخستن ··

**١٢ــ پێوە (پێڤه) پێ + وه :**

**بۆ نموونه :**

پێوەبوون ، پێوەکردن ، پێوەدان ·

له هیچی نەبوو باش پێوە بوو ·

کەس پێوەی نەکرد ئەو نەبێت ·

دەرگاکان پێوەدەن دنیا شەوە ·

وەك مار به خەڵکەوە دەدات (وەك مار پێوەی ــ یان ــ پێیەوە دا) ·

**١٣ــ وە ــ ڤه ، پێشگر و پاشگره :**

وەکردن (کردنەوە) ، وەبوون ، بوونەوە ، وەهاتن (هاتنەوە) ، وەخواردن (خواردنەوە) ··· هتد ·

دەرمانەکەی خواردەوە نەختێك داسەکنی ·

که دەرگاکەی کردەوە و چاوی پێ‌کەوت شاگەشکه بوو له خۆشیدا ·

**١٣م ــ ڕۆ ــ ڕو :**

ڕۆنشتن (دانیشتن) ، ڕۆکردن (وەك : دا ــ بۆ خوارەوەیه)·

**١٤ـ تێدا ، تێ + دا :**

تێدامان ، تێدابوون ·

دڕکەکەی هەر تێدا ما ·

کە کردمەوە پارەکەی تێدابوو ·

**١٥ـ تێڕا :**

تێڕامان ، تێڕاچوون (پێداچوون) ·

هەر تێمڕادەمێنێت (هەر سەیرم دەکات) ، دیارە شێوەم دەکات ·

**١٦ـ پێڕا ـ هاومەبەستی پێدایە (بەگشتی) :**

پێڕاگەیشتن (پێداگەیشتن) ·

ئێستا نەڕۆم ئیتر پێڕاناگەم و لە دەستم دەچێت ·

بە کورتی بۆمان دەرکەوت پێشگر چیە و چۆن بەکاردێت و چ دەورێکی هەیە لە دروست کردنی دەیەها وشە و واتای نوێدا : بشزانە کە :

١ ـ دەچنە سەر هەندێك چاوگ کە ئەمڕۆ بە تەنیا بەکارنایێن ، چونکە بەشێکیان ئەوانەن کە دروست بوون و بەڵام لەبەر قورسیی بەکارهێنان ، یان هەر هۆیەك بە تەنیا و بێ پێشگر بەکارنایێت ، هەشن کۆنن و ئاڵوگۆڕیان بە سەردا هاتووە و لەوانەیە لە واتای بنجی خۆیان کەوتبن و ئەمڕۆ بە یاریدە پێشگر هاتوونەتەوە کایە وەك :

هەڵواسین ، هەڵتوتان ، هەڵترووشکان ، هەڵبزرکان هەڵقرچان ، هەڵکەندن · هتد ··

٢ ــ هەندێکیان هەر پێشگرن وەك :

هەڵ ، تێ ، پێ ، لێ ، تێك ، پێك ٠٠٠

٣ ــ هەندێك پێشگر و پاشگرن وەك :

وەر ، وە ٠٠٠ (ئافیکس)ن ٠

٤ ــ هەندێك پێشگر و ئامرازن واتە رووالەتیان یەکە وەك :

را ، دا ، وە ٠٠٠

٥ ــ هەن سادەن و هەن لێکدراون وەك :

أ ــ هەڵ ، دا ، را ، وە ٠٠٠

ب ــ پێ ، تێ ، لێ ، (رووالــەتیان سادەیە بــەلاّم لــە ئامراز و راناو دروست بــوون وەك : پێ (بە+ئەو) ، تێ (تێ+ئەو) ، لێ (لە+ئەو) ٠

لێکدراو وەك : پێدا (پێ+دا) ، تێدا (تێ+دا) ، تێرا (تێ+را) پێوە (پێ+وە) ٠

٦ ــ پێشگر دوو بەدووش دەچنە سەر فرمان و واتایێك دروست دەکەن کە هیچ پێشگرێك بە تەنیا پێی ناکرێت ، وەك :

تێوەردان ، تێهەڵدان ، جگە لە پێشگرە لێکدراوەکان ٠

٧ ــ لەناو خۆیاندا هاوواتا و دژواتا دروست دەکەن :

رۆ ــ دا ، لێ ــ ژی ، هاوواتا ٠

هەڵ ــ ڕا ــ دژواتا

پێدا ــ پێڕا ــ هاوواتا

**ڕاهێنان :**

ئێوەش هەوڵ بدەن لیستەیێك بکەن بۆ ئەو پێشگرانە لەگەڵ

ئەو فرمانانەدا کە لێرەدا نەهاتوونەتەوە و لە ڕستەدا بەکاریان بهێنن ، دەشتوانن بە یاریدەی فەرهەنگ بگەن بە ئەنجامێکی باش لەگەڵ هەوڵی خۆتان ٠

ا ــ بۆ ئەوەی بزانن چی و چەند (وشە و چاوگ و فرمان)ی نوێ دروست دەکەن پێکەوە ٠

ب ــ لە ڕێی رستەوە بۆ ئەوەی واتاکانیان بزانن ، چونکە هەیە زیاتر لە واتایێك دەگەیێنێت ٠

ج ــ لیستەیێك بۆ ئەو چاوگ و فرمانانە بکەن کە بە تەنیا بەکارنایێن و بزانن چەند فرمان دەهێننە کایەوە ٠ بە یاریدەی کتێبی (چاوگی بێواتا و چۆنێتی بەکارهێنانیان)(★) ٠ بە مەرجێك لەوانە نەبێت کە لەو کتێبەدا هەن ٠

د ــ لەمانە دەیەها ناویش پێك‌دێت لیستەیێك بکەن بۆ ئەو ناوانە ، بۆ نموونە : هەڵکەوت ، هەڵمەت ، هەڵمات ، هەڵماتێن ، دابەستە ٠٠٠٠

سەرنج :

بەڵام هەمیشە بزانن کە پێشگر بە تەنیا نانووسرێت

بەڵکو دەبێت بلکێت بە پێش چاوگ و فرمانەوە ، چونکە سەربەخۆ نین و بە تەنیا واتا نابەخشن و بەکارنایێن و لەگەڵ ئەو چاوگ و فرمانانە یەکێتی دروست دەکات لە رووالەت و ناوەرۆکدا ، تەنیا بە ناچاری لە یەك جودا دەبنەوە هەندێك جار لە رستەدا ٠

چراکەم هەلکرد ، چراکە هەڵدەکەم ، هەڵم کرد ٠

## پاشگر و چاوگ و فرمان

لەم زمانەدا دوو پاشگر هەیە :

١ ـ پاشگری (اندن ـ Andin)

٢ ـ پاشگر و پاشگری (وە ـ ڤە) ٠

هەرچەندە ئەم دورانە جیاوازی و پەیوەندییان لە نێوانـدا هەیە ، بەڵام کەلێنێکی باش لەم زمانەدا پڕ دەکەنەوە بەو دەورە گرنگ و باڵایەی دەی‌نوێنن(★) ٠٠٠

یەکەم ـ پاشگری (اندن)و دەوری لەدروستکردنی وشەو واتادا:

١ ـ ناوی دەنـگە سروشـتیەکان لـە نـاوەوە دەکات بـە چاوگ و فرمـانی دروستکراو بەمە دەیەها چـاوگ و فرمانی نوێ دروستکراو دەبەخشێت بە زمان ، وەك :

لوورە لوور ـ لوورە ـ لووراندن ـ گورگەکە دەلوورێنێت٠
نووزە نووز ـ نـووزە ـ نووزانـدن ـ ئـەو منداڵـە هەر دەنووزێنێت ٠ گرمە ـ گرماند : هەورەکە کە گرماندی داچڵەکیم ٠٠٠ هتد ٠

٢ ـ دروستکـردنی چـاوگی تێپـەڕ بـەبێ دیاربـوونی تێنەپەڕەکەی وەك :

خایاندن ، درکاندن ، سەپاندن ٠٠٠ هتد ٠ بەمە چەندین وشە دەخاتە پاڵ ئەوەی هەن ٠

٣ ـ چـاوگ و فرمانی بێگانـە دەگۆڕێتە سەر کـوردی ، بەمەش دەیەها چاوگ و فرمانی نوێ دروستکراو دەچێتە پاڵ

ئەوەی هەن وەك :

تەمراندن (کوژاندنەوە) ، تاراندن :

کورکە و نیو حیلەی ئالیك دواکەوتوو

خەو ئەتارێنێ لە چاوی نوستوو

جەڕاندن ، خملاندن ، کەواندن (داغکردنی زام) •• هتد•

٤ ـ چاوگی بەکار نەهاتوو بە تەنیا دەهێنێتەوە کۆڕی کارەوە ، وەك :

خایاندن ، تەکاندن ، ڕواندن ، وەشاندن ، فریواندن (فریودان) ••• سەرنجی (چاوگی بێ واتا بدەن) •

٥ ـ تێنەپەڕ دەکات بە تێپەڕ بە ژمارەیان ئەوەندە چاوگی تێپەڕی دروستکراو دەچێتە پاڵ فەرهەنگی وشەکانی ئەم زمانە•

٦ ـ هاومەبەست دروست دەکات بۆ تێپەڕی ئەوانەی تێنەپەڕیشیان هەیە وەك :

ڕژان ـ ڕشتن ـ ڕژاندن •

پچڕان ـ پچڕین ـ پچڕاندن •

٧ ـ دەچێتە سەر هەندێك چاوگ و فرمان و دوو واتا دروست دەکات وەك :

چوون ـ چوواندن :

١ ـ لەکیس چوون ، لەناوبردن •

٢ ـ ناردن •

نوستن ـ نوواندن :

١ ـ خەواندن ٠

٢ ـ نازکردن و خۆپیشاندان ٠

گیانەکەم دوێنێ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند

نەك نمەكگیر بم بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەمدواند

٠٠٠ هتد ٠

وا بزانین ئەمە بەسە بۆ ئەوەی بزانین چەند چاوگ و فرمانی دروستکراو لە پاڵ واتا و مەبەستی نوێدا بە یاریدەی ئەم پاشگرە پێك‌دێت چەند ژمارەی نوێ دەچێتە ڕیزی ئەو ژمارانەی هەن لەم زمانەدا ٠

## بۆ ڕاهاتن :

١ ـ هەر یەکە هەوڵی کردنی لیستەیێك بدات بۆ هەر بەشە بە تەنیا و لە ڕستەدا بەکاریان بهێنێت بۆ دۆزینەوەی واتاکانیان ٠

٢ ـ لیستەیێك بۆ ئەوانەی بەبێ (اندن) بەکار نایێن پاشان ڕوون کردنەوەیان لە ڕستەدا باشتر ئەوەیە لە قسەی ڕۆژانە و پەند وەربگیرێن ٠

٣ ـ لیستەیێك بۆ وشەی عەرەبی و بێگانەی‌تر و دەرخستنی واتایان لە ڕێی ڕستەوە و بەراوردی کردنی واتاکانیان لەگەڵ واتاکەی لە زمانی عەرەبیدا یان ئەو زمانەی لێیەوە هاتووە ٠

## ـ پاشــگر و پێشگر ـ

## یان ( ئافیکس ـ وە ـ ڤە ) و دەوری لە دروست کردنی وشەی ناسادە (دروستکراو)دا

ئەم ئافیکسە پێشگر و پاشگرە لەگەڵ فرمانــدا و دەورێکی بالاّی هەیە لە دروست کردنی چاوگ و فرمانی دروســتکراوی خاوەن واتا و مەبەستی نوێ ، لەوانە :

١ ـ گۆڕینی (مفهوم)ی چاوگ و فرمان وەك :

ـ گۆڕین ـ گۆڕینەوە (بۆ شت یان پارە) •

ـ خــواردن ـ خــواردنــەوە ـ ڤــەخــوارن ـ (شــرب ـ ئاوخواردنەوە) •

ـ کوشتن ـ کوشتنەوە ـ سەربڕین ـ بۆ گیانلەبەر •

ـ مان ـ مانەوە •

ـ بەردان ـ بەردانەوە •

ـ سووتان ـ سووتانەوە (بۆ برین و جێیێك بڕوشێت) •

٢ ـ گۆڕینی واتای وشە پاش دروستکردنی وەك :

ـ کردن ـ ڤەکردن ـ کردنەوە (دژی داخستن)

دەگری بە ناڵە و واتەوە

بەڵکو گوڵ دەم بکاتەوە .

چوون ـ چوونەوە (بۆ ڕەنگ)

خوێندن ـ خوێندنەوە (بۆ کتێب ـ قراءة)

چنین ـ چنینەوە (بۆ گوڵ و شتی هورد)

گرتن ــ گرتنەوە (دەستگرتنەوە یان شت)

٣ ــ گۆڕران لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی‌تر ، وەك :

چوون ــ چوونەوە (ڕەنگەکەی چۆتەوە)

ژیان ــ ژیانەوە (تازەبوونەوە)

گەڕان ــ گەڕانەوە ــ ڤەگەڕان ، وەك :

مژدەبێ ساڵ گەڕایەوە ئاگری نەورۆز کرایەوە

٤ ــ گەڕانەوە بۆ دواوە ، بۆ هەمان شوێن ، وەك :

گەڕان ــ گەڕانەوە ــ ڤەگەڕان

هاتن ــ هاتنەوە

چوون ــ چوونەوە

ڕۆیشتن ــ ڕۆیشتنەوە ، بۆ نموونە :

«بە سەر شۆڕی و دڵ شکاوی و ڕوو ڕەشی گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی» .

٥ ــ دووبارەبوونەوەی فرمان و کار جارێك یان زیاتر ، وەك :

سەرکەوتن ــ سەرکەوتنەوە

نووسین ــ نووسینەوە

خوێندن ــ خوێندنەوە

«بەم ڕەنگە جارێکی‌تریش هۆز سەرکەوتەوە» .

٦ ــ دەبێتە هۆی دروستبوونی دوو واتا یان زیاتر بۆ هەمان وشە ، بۆ نموونە :

بردن ــ بردنەوە

١ ــ گەڕاندنەوەی شت .

٢ ــ دەستکەوتن و قازانجکردن .

گۆڕین ــ گۆڕینەوە :

١ ـ دووباره گۆڕین ٠

٢ ـ گۆڕینەوەی شتێك بە شتێكی‌تر ٠

٣ ـ وردكردنەوە (بۆ پارە) ٠

٧ ـ پێكهاتنی دوو مەبەست بۆ هەمان وشە كاتی بەكارهێنانی ، وەك پێشـگر و پاشگر لەگەڵ وشەدا ، واتە بـە پێچەوانەی خاڵی پێشـوو ، ئەمەش بەتایبـەتی لە شـێوەی ژووروودا دەردەكەوێت ، بۆ نموونە :

خواردن ـ خواردنەوە ـ ڤەخواردن

هاومەبەست

بەڵام : وە خواردنـەوە : دووبـارە كردنـەوەی ڤەخواردن (خواردنەوە) ٠

وایە (وە)ی یەكەم بۆ مەبەستی نوێ ٠

(وە) دواوە بۆ دووبارەكردنەوەی كارەكە ٠

٨ ـ پێكهاتنی هاومەبەست بە یاریـدەی (وە) بۆ هەندێك وشەی پێشگریان وەرگرتووە ، وەك :ـ

مردن ـ مراندن ـ دامراندن ـ ڤەمراندن (كوژاندنەوە)

فلیقان ، بە تەنیا بەكار نایێت (هەڵفلیقان ـ فلیقانەوە)

٩ ـ زیندووكردنەوەی ئـەو چاوگانـەی ئێستا بـەبێ پێشگر و پاشگر بەكار نایێن ، وەك :

حەسان ـ وەحەسان ـ حەسانەوە ٠

پاڕان ـ پاڕانەوە

لاڵان ـ لاڵانەوە

تلان ــ تلانەوە

هەروەها : چووزانەوە ، چەوسانەوە ، بوورانەوە ، گەشانەوە ، لەرانەوە ، بریسکانەوە ، کزانەوە ، هۆنینەوە ... هتد .

بۆ نموونە :

«بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی بیانڕووتێنێتەوە و بیانچەوسێنێتەوە» .

دەڕژا بە سەریا کزە بای بەیان
ئەیلەرانەوە کوللە و پەردەکان

**سەرنج :**

ئەمانە و وشەکانیتریش کە هەن و لێرەدا ماوەی هێنانەوەیان نیە بە پێی پێویست پاشگری (اندن) وەردەگرن بە گشتی گشت تێنەپەڕەکان بۆ کردنیان بە تێپەڕ ، بۆ نموونە :

حەسانەوە ــ حەسساندنەوە

گەڕانەوە ــ گەڕاندنەوە

پەڕینەوە ــ پەڕاندنەوە

بەڵام هەمیشە (وە) دوای (اندن) دێت ، واتە :

چاوگ و فرمان + پاشگری (اندن) + پاشگری (وە) .

بەڵام ئەگەر (وە) لە پێشەوە بوو وەك خۆی دەمێنێتەوە .

وەحەسان ــ وەحەساندن

**ڕاهێنان :**

١ ــ هەوڵی کۆکردنەوەی چاوگ و فرمانیتر بدەن بەو

جۆرەی سەرەوە و لەوانەی لێرەدا نەهاتوونەتەوە پاشان بە پێی واتا و مەبەست دابەشیان بکە ٠

٢ ـ ئەوانەی دوو واتا دروست دەکەن جودایان بکەنەوە ٠

٣ ـ ئەوانە بە تەنیا بەکار نایێـن ـ لیستەی تایبەتییان بۆ بکەن ٠

٤ ـ گشتیان لە ڕێی ڕستەوە ڕوون بکەنەوە ٠

٥ ـ لەگەڵ پاشگری (اندن) بەکاریان بهێنن ٠

٦ ـ لەگەڵ ئـەو چاوگانەدا بەکاریان بهێنن کـە پێشگریان وەرگرتووە وەك : بوون ، لێبوونەوە ، لێکدانەوە ٠

## وشـــەی لێکدراو

### چاوگ و فرمانی لێکدراو :

وشەی لێکدراو ئـەو وشەیەیە کـە لە دوو وشە یـان زیاتر پێكدێت ٠

### چاوگ و فرمانی لێکدراو :

بەو چاوگ و فرمانانە دەگوترێت کـە وشەیێك یان زیاتر دەچنە پاڵی بـۆ دروستکردنی ئەو وشە و واتا نوێیانەی کـە بە تەنیا هیچیان پێیان ناکرێت ٠

لە پێشەوە دەرمانخست وشە چیە ، یان بەشەکانی ئاخافتن لە چی و چی پێك دێت ٠

ئێستا تەنیا باسی فرمانی لێکدراو دەکەین کە پاش فرمانی سادە ، دروستکراو دێت ، کەواتـە فرمان بە پێی ڕووالەت سێ بەشە :

١ ـ سادە ٠

٢ ـ دروستکراو (داڕێژراو) ٠

٣ ـ لێکدراو ٠

بەڵام پێویستە بزانین هیچ گۆڕینێك بە ڕێکەوت و هەروەها بەسەر ڕوواڵەتی وشـەدا نایێت بەڵکو پێویستی فـەرزی دەکات ئەویش دروستکردنی واتا و مەبەستی نوێیە کە پەیوەندیی بە ناوەرۆکەوە هەیە ٠

هەر زمانـە ئەنجـامی پەرەسـەندن و بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵە گەشـە دەکات ٠٠٠ وشەی دروستکـراو و لێکدراویش

دڕان ــ دڕین ــ دڕاندن ٠

یەکێکن لەو ڕووە ڕوون و ئاشکرایەی کە خاسیەتی ئەم دەخاتە ڕوو، بەڵام تائێستا مافی خۆی نەدراوەتێ، ناڵێین کەمتەرخەمیو هەەی لەگەڵدا کراوە و تا ڕادەییێك ئەم لا گرنگە تێكدراوە ٠

فرمانی لێکـدراو مەرجە فرمـانی تێدا بێت و مەرجـە یەك فرمانیش زیاتر نەبێت ٠

فرمانی لێکـدراو هەرچەندە هەمـوویان لێکـدراون بەڵام دەتوانین لە نـاو خۆیاندا بـە پێی خاسیەتی تایبـەتی دابەشیان بکەین بۆ ئەوەی زیاتر دەور و گرنگییان بخەینە ڕوو ٠

لە پێشەوە سەرنجی ئەم نموونانە بدەن :

دەستکەوتن

سزاکێشان

سەربڕین

سەوزبوون

| | |
|---|---|
| سەردان | پێچخواردن |
| شێن بوون | خۆ بەختکردن |
| نانکردن | لێڵکردن |
| سوور بوون | خۆ شوشتن |
| نوێژکردن | لوولکردن |
| پەككەوتن | لەخۆچوون |
| ئیشکردن | تا لێ هاتن |
| زەردهەڵگەڕان | بیرکردنەوە |
| بانگدان | لەرز لێ هاتن |
| دواكەوتن | تاقیکردنەوە |
| چاو پۆشین | ئازار كێشان |
| دواخستن | بەرەڵلابوون |
| دەركەوتن | شلکردن |
| لێ خۆش بوون | توندکردن |
| سەرخستن | واق وڕمان |
| تێك بەربوون | سەرسڕمان |
| پێشكەوتن | هاتوچۆ کردن |
| سەرمابوون | پاڵ پێوەنان |
| پاشكەوتن | پشتگرتن |
| كرژبوون | جێ بەجێ کردن |
| دەست بڕین | وردبوونەوە |
| خۆکوشتن | ئاشت بوونەوە |

زیز بوون
گزیکردن
چارەسەرکردن
داغکردن
تیمارکردن
گلدانەوە

**فرمانی لێکدراو پێك دێت لە :**

**١ ــ ناو + فرمان (چاوگ)**

ئەم ناوانەش دەکرێن بە چوار بەشەوە :

یەکەم : ئەو ناوە سەر بە خۆیانەی هەن ٠

دوو : ئەو ناوانەی ئەوە بە تەنیا بەکار نایێن وەك :

تەفرە ــ وەك تەفرەدان ــ تەفرە خواردن ٠

فرێ ــ وەك فرێ دان ٠

واز ــ وەك : وازهێنان ، وازهاوردن ٠

بەڕەڵلا ــ وەك بەڕەڵلا بوون، بەڕەڵلا کردن ٠

سێ : ئەوانـــەی ڕەنگن لەگـــەڵ (بوون) دەبن بە تێنەپەڕ و لەگەڵ (کردن) بە تێپەڕ ٠

وەك :

| | تێنەپەڕ | تێپەڕ | |
|---|---|---|---|
| سوور | سووربوون | سوورکردن | شین |
| سەوز | سەوزبوون | | کەسك |
| زەرد | | | مۆر |
| ڕەش | | | ئاڵ |
| سپی | | | |

چوار : ناوی دەنگی سروشتی لەگەڵ (هاتن) و (کردن) کە فرمانی یاریدەدەرن ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| گرمە | گرمەگرمهاتن | گرمەگرمکردن |
| لوورە | لوورەلوورهاتن | لوورەلوور کردن |
| نووزە | نووزە نووز هاتن | نووزە نووزکردن |
| قیڕە | قیژە قیژ هاتن | قیڕە قیڕ کردن |
| قیژە | قیڕە قیڕ هاتن | قیژە کردن |
| بۆڵە بوڵ | بۆڵەبۆڵهاتن | بۆڵە بۆڵ کردن |
| تەقە تەق | تەقە تەق هاتن | تەقە تەق کردن |
| چەقە چەق | چەقە چەق هاتن | چەقە چەق کردن |
| نقەنق | نقە نق هاتن | نقەنق کردن |
| منگە منگ | منگە منگ هاتن | منگە منگ کردن |
| شیڕە شیڕ | شیڕە شیڕ هاتن | شیڕە شیڕ کردن |

٢ ــ ئەو چاوگە لێکدراوانەی پێك دێن بە یاریدەی ئاوەڵناو و فرمانی یارمەتیدەر ٠

| ئاوەڵناو | فرمانی لێکدراو | |
|---|---|---|
| سارد | ساردبوون | ساردکردنەوە |
| فێنك | فێنك بوون | فێنكبوونەوە |
| لاڵ | | |
| کەڕ | | |
| کوێر | | |
| شەل | | |
| گەرم | | |

چاك

كێژ

خڕ

سڕ

خێل

پاك

كۆچ

٣ ـ بە یاریدەی ڕاناو (ڕاناوی خۆیی‌و ڕاناوی هەیی) ، وەك :

خۆكوشتن

خۆشوشتن

خۆبەخت كردن

خۆهەڵواسین

خۆهەڵكێشان

خۆنوواندن

لەخۆ بایی‌بوون

خۆتوش كردن

هەیی

هەبوون(*)

هەم ـ هەبووم

هەمە ـ هەم بوو

٤ ـ بە یاریدەی ئامراز ، ئامراز بە تەنیا كەم بەكاردێت لەگەڵ چاوگ‌و فرماندا بۆ ئەم مەبەستە بە پێچەوانە ناوی لێكدراو

---

● لەگەڵ پێشگـــردا و هەروەها لەگەڵ ئامرازدا پێشگریان دروســـت كردووە بگەڕێینەوە سەر پێشگر لەم باسەدا و لێی ورد بینەوە ٠

گە ئامراز دەوری هەیە تێیدا ، هەروەها لەگەڵ وشەی‌تردا دەچێتە سەر فرمان وەك :

بۆچوون
لەبارچوون
لەناوچوون
لەناوبردن

٥ ـ لەگەڵ ناوی ژمارە (یەك) ، وەك :

یەكگرتن
یەك لایی كردەوە
یەك بوون

٦ ـ لەگەڵ ئاوەڵكاردا ، وەك :

پێش‌كەوتن
پاش‌كەوتن
سەركەوتن
بەركەوتن
دواكەوتن
دواهاتن
دوابڕین

٧ ـ هەروەها ئەم وشانە لەگەڵ پێشگر و پاشگریشدا پێكەوە و بە پێی پێویستی و گونجان دەچنە پاڵ یەك و لەگەڵ فرمانێكدا و دەیەها وشە و واتای تازەی‌تر دروست دەكەن ، بۆ نموونە :

سەر + سڕ + مان = سەرسڕمان

واق + ووڕ + مان = واقووڕمان

سوور + بوون + ەوە = سووربوونەوە

سوور + هەڵ + گەڕان = سوورهەڵگەڕان

کۆڵ + نە + دان = کۆڵنەدان

چاك + بوون + وە = چاكبوونەوە

لە + ناو + بردن = لەناوبردن

لە + ناو + چوون = لەناوچوون

لە + کیس + چوون = لەکیسچوون

لە + کیس + دان = لەکیسدان

بە + جێ + هێشتن = بەجێهێشتن

بە + خێو + کردن = بەخێوکردن

بە + ڕێ + کردن = بەڕێکردن

لە + خۆ + بایی + بوون = لەخۆباییبوون

لە + دەست + دەر + چوون = لەدەستدەرچوون

لە + خشتە + بردن = لەخشتە بردن

لە + تاس + ە + وە + چوون = لەتاسەوەچوون

وورد + بوون + ەوە = ووردبوونەوە

پاڵ + پێوە + نان = پاڵپێوەنان

هتــد ...

**فرمانی یارمەتیدەر :**

ئەو فرمانانەن کە سەرەڕای دەوری خۆیان وەك فرمانێکی سەربەخۆ ، دەوریشیان هەیە لە شوێنی تردا ، لەوانە :

١ ــ دروست کردنی وشه و واتای نوێ له زماندا •
٢ ــ له دروست کردنی بنکه له ڕێزماندا •
٣ ــ له یارمه‌تیدانی هه‌ندێك بنکه‌ی تر بۆ دروست بوونی لق و پۆپێك که په‌ره‌سه‌ندن و ووردی زمانه‌که به دیار ده‌خات •

له‌گه‌ڵ خاسیه‌تی تر که لێره‌دا ماوه‌ی باسکردنی نیه به‌ڵکو له شوێنی تری ئه‌م کتێبه‌دا باسکراون به پێی به‌کارهێنانیان •

هه‌روه‌ها له غه‌یری ئه‌م کتێبه‌دا به‌دوورو درێژی لێیان دواوین •

لێره‌دا ته‌نیا خاڵی یه‌که‌م به‌کورتی ده‌خه‌ینه روو :

له دروست کردنی یان دروستبوونی وشه‌ی لێکدراو و فرمان و چاوگی لێکدراو ، به‌و چاوگ و فرمانانه ده‌ڵێین یارمه‌تیده‌ر که یارمه‌تیی ئه‌و وشانه ده‌ده‌ن که فرمان نین یان فرمان نیه به‌رانبه‌ر بۆیه توانای به‌کارهێنان و گۆڕینه‌وه‌یان نیه، به یاریده‌ی ئه‌م فرمانانه ده‌که‌ونه جموجووڵ و به پێی پێویست و کاته‌کان ده‌کرێنه‌وه و جۆره‌ها مه‌به‌ست به‌یان ده‌که‌ن •

له‌و فرمانه یارمه‌تیده‌رانه‌ی چاوگ و فرمانی لێکدراو دروست ده‌که‌ن : هاتن ، بوون ، کردن ، له‌گه‌ڵ :

١ ــ ناوی ده‌نگی سروشتیدا وه‌ك :

زیقه‌زیق ــ زیقه‌زیق‌هاتن ــ زیقه‌زیق‌کردن

منجه‌منج ــ منجه‌منج‌هاتن ــ منجه‌منج‌کردن •

زووره‌زوور ــ زووره‌زوورهاتن ــ زووره‌ زووڕکردن •

هتـد ...

ئەگەر لەو نموونانەی ســەرەوە وورد بینــەوە دەبینین ــ هاتن و کردن ــ هاومەبەستیان لە ناو خۆیاندا دروســت کردووە سەرەڕای دروست کردنی وشە و واتای نوێ ٠

٢ ــ لەگەڵ ناوی ڕەنگدا وەك :

بوون ــ کردن

وەك :

زەرد زەردبوون زەردکردن = ڕەنگ کردن بە زەرد ٠

نیوە کولانی ڕووەك ٠

سوور سووربوون : سوورکردن

١ ــ ڕەنگ سووربوون ٠

٢ ــ اصرار ٠

شین شینبوون : شین کردن

١ ــ ڕەنگ شینبوون ٠

٢ ــ بووژانەوەی گژوگیا ٠

سەوز سەوزبوون : سەوزکردن

١ ــ ڕەنگ سەوزبوون ٠

٢ ــ نەشونەمای ڕووەك ٠

هتـد ...

١ ــ ئەگەر ســەرنجی کۆمەڵی یەکــەم بدەین لەگــەڵ (بوون)دا چاوگ و فرمانی تێنەپەڕن و لەگەڵ (کردن)دا لە کۆمەڵی دووەم تێپەڕن ٠

٢ ــ ئەگەر سەرنج بدەین دووبارە دەبینین ، زۆر جار دوو واتا

یان زیاتر دروست دەکەن •

لەگەڵ جووتە وشەدا :

بە یاریدەی : بوون ــ تێنەپەڕ •

کردن ــ تێپەڕ •

وەك :

هاتوچۆ ــ هاتوچۆکردن

گفتوگۆ ــ گفتوگۆکردن

پەلوپۆ ــ پەلوپۆکەوتن

لەتوپەت ــ لەتوپەتکردن ــ لەتوپەتبوون

ووردوخاش ــ ووردوخاشکردن ــ ووردوخاشبوون

پارچە پارچە ــ پارچەکردن ــ پارچە پارچەبوون •

پارچەبوون

ئەنجن ئەنجن ــ ئەنجن ئەنجن کردن ــ ئەنجن ئەنجنبوون

هەپروون هەپروون ــ هەپروون هەپروون کردن
هەپروون هەپروون بوون

شیتر شیتر ــ شیتر شیتر کردن ــ شیتر شیتر بوون

••• هتد •

وەك بۆمان دەرکەوت :

دووبارە بە یاریدەی (کردن و بوون) دروست دەبن و لەناو خۆیاندا دەبن بە تێنەپەڕ و تێپەڕ •

لەگەڵ ئەم جۆرە وشانەدا :

نوێژکردن ــ (عمل الصلاة) نەك (صلاة)ە •

نانکردن ـ (عمل الخبز) نەك ـ خبز ۰

هەروەها :

کوێرکردن

کەڕکردن

هارکردن

شێتکردن

پاككردن

ساردکردن

لەمانەدا زۆربـاش هەر وشـەیە واتای خـۆی پاراستووە و دیار و ڕوونە نەك چوونەتـە ناو یەك و واتایێکیتـری نوێیان دروست کردووە کە لە هیچیاندا نیە ۰

بۆ ئەوەی زیاتر دەرکەوێت سەرنجی ئەم نموونانە بدەن کە فرمانەکان یارمەتیدەر نین ۰

نموونە :

سەردان = زیارة (بینین)

سەربڕین = کوشتنەوە (ذبح)

دڵدانەوە = مواساة

دەستکەوتن = حصول

پێشکەوتن = تقدم

پاشکەوتن = تاخر

سەرکەوتن = صعود

دروستکردن = صنع

ڕاهێنان :

١ ــ بۆ وشەی ناسادە بە هەردوو بەشەکەیەوە دروستکراوو لێکدراو ··· ئەنجامێکی ڕێکوپێك بنووسە لەسەرخۆ ·

٢ ــ بگەڕێرەوە بۆ سەرچاوەیێك زیاتر بۆ بەراوردیکردن·

٣ ــ لیستە بکە بۆ هەر بەشە و ئەو وشانە بنووسەوە کە لێرەدا نەهاتوونەتەوە بە مەرجێك لە ڕستەی باشدا دابنرێن و واتاکانیان دەستنیشان بکرێت ·

٤ ــ هەبوون ــ کە بە واتای (وجود ــ ژیان)

بە واتای (خاوەنێتی ــ تملك)

بگۆڕنەوە و جیاوازیی دەربخەن

٥ ــ ئەو چاوگ و فرمانانەی ( خۆ )یان تێدایە کۆیان بکەنەوە ، پاشان بیانخەنە ڕستەوە و واتاکانیان دەربخەن و بزانن (خۆ) چ کارێك دەکاتە سەر ئەو وشانە بەتایبەتی لە ڕستەدا · ئینجا لە قسە و گفتوگۆی ڕۆژانەی باو و پەندی پێشینان کۆیان بکەرەوە ·

٦ ــ ئەنجامی (فرمانی یارمەتیدەر) بنووسە ، پاشان بگەڕێرەوە بۆ چەند سەرچاوەیێك بزانە چۆن باسکراون ·

جیاوازیشیان لە فرمانیتر دەربخەن و هەوڵی کۆکردنەوەی فرمانە یارمەتیدەرەکان بدەن بە نموونەوە ·

٧ ــ لیستەیێك بکەن بۆ ئەو وشە ( چاوگ و فرمان)ە لێکدراوانەی لەگەڵ وشەکەدا یەکێتیان دروست کردووە کە واتا و ئەوانەی واتای هەر یەکەیان بە تەنیا

دیاره هەرچەندە پێکەوەن ٠

## باسی نۆیەم : فرمانی بکەر دیار

## باسی دەیەم : فرمانی بکەر نادیار

### ١ ـ فرمانی بکەر دیار :

بەوانە دەگوترێت کەبکەرەکانیان دیار و ناسراون ، ئەمەش له هەموو رستەیێکدا یەکسەر بەدی دەکرێت بۆ نموونە :

ـ براکەم دەرچوو

ـ ئەو قوتابیە دەرسەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ ئامادە دەکات ٠

ـ نووسەرەکە کتێبێکی نوێ تری تەواو کرد ٠

ـ ئەم لە پشووی هاویندا دەچم بۆ هاوینەهەوارێك ٠

هتـد ٠٠٠

### فرمانی بکەر نادیار :

پێش باسکردنی پێویستە ناوەکەی ڕوونبکەینەوە چونکە تا ئێستا بە (فرمانی نەناسراو و فرمانی نادیار) ناونراوە ٠

پێش هەموو شتێك ئەم ناوە راست نیە چونکە فرمانە و زۆر باش دیار و ناسراوە چونکە ئەگەر فرمان دیارنەبوو رستەشی پێك نایێت لەم شوێنانەدا ٠٠٠ بەڵکو خاوەن کارەکە کە (بکەر)ە ئەو دەرناکەوێت یان دەرناخرێت لەبەر هەر هویێك بێت ٠٠٠

کەواتە فرمانی بکەر نادیارە ، هەروەها ئەگەر دەرکەوێت دەناسرێت ، کەواتە نادیارە نەك نەناسراوە ، چونکە شارراوەیە ، چونکە دەشاررێتەوە ٠

هەروەها فرمانی بکەر نادیار دەبێت هەمیشە تێپەڕ بێت ،

واته بە هیچ جۆرێك لە تێنەپەڕ دروست نابێت کەواتە فرمانەکە یان دروستکراوە واتە لە تێنەپەڕەوە دەکرێت بە تێپەڕ یان هەر خۆی تێپەڕێکی بنجییە ٠

هـەر ڕستەیێك بە ئاسـانی دەکرێت بە بکەر نەناسراو لە ناسراوەوە ٠ ئەمە لـە هەموو زمانێکدا هەیە و هەروەها لە هەر زمـانەدا بنکەی تـایبەتی و نیشانەی تایبتەتی هەیە بۆ دروست کردنی ٠ ٠ ٠ بەم جۆرەش لە زمانی کوردیدا ٠

چۆنێتی گۆڕینی ڕستەی فرمان بکەر ناسراو بۆ ڕستەی بکەر نەناسراو؟

یان ـ ڕستەی فرمان بکەر نەناسراو دروست دەبێت ؟ ٠

لەم زمانەدا دوبنکەی دیار هەیە بۆ دروست کردنی ئەم جۆرە فرمانانە ٠

**بنکەی یەکەم :**

بەیاریدەی ئامرازی (ڕا) بۆ ڕابوردوو ، وە (ڕێ) بۆ ئێستاو داهاتوو ٠

**بنکەی دوەم :**

بە یاریدەی فرمانی یارمەتی دەر (هاتن) بە گۆڕینەوەی بۆ
بۆ + چی       لۆچیپێشتر نای ناسیت ؟
ڕابوردوو و ئێستاو داهاتوو بە پێی پێویست ٠

پێشتر گوتمان کە دەبێت فرمانـەکە هەمیشە تێپەڕ بێت ج سادە یان دروستکراو یان لێکدراو بێت ، چونکە بە وونبوونی یان لادانی (بکەر) لە ڕستەدا (کراو) بەرکار کەوتووە (مفعول)

دێته جێگەی و ئەو ئامرازانه دەلکێن بەوەوە •

بۆ نموونه :

قوتابیەکه دەرسەکەی نووسی •

دەرسەکه نووسرا

کێڵان ـ جووتیارەکه زەویەکه دەکێڵێت •

زەوییەکه دەکێڵرێت •

سووتاندن ـ پووشەکەیان سووتاند •

پووشەکه سووتێنرا •

خوێندن ـ دەرسه تازەکه ئەمڕۆ دەخوێنین •

دەرسه تازەکه ئەمڕۆ دەخوێنرێت •

فرۆشتن ـ ئەو زەوییە زۆرباشه بۆیە بەئاسانی دەفرۆشرێت

ئەو زەوییە زۆرباشه بۆیە بەئاسانی دەیفرۆشێت

... هتد •

ئەگەر سەرنجی نموونەکان بدەین ئەمانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە :

له ڕابوردوودا پێكدێت له :

ڕەگی فرمانی چاوگی تێپەڕ + ئامرازی (ڕا)

نووسین : نووس + را = نووسرا

کڕین : کڕ + ڕا = کڕڕا

بینین : بین + ڕا = بینرا

هەڵواسین : هەڵواس + را = هەڵواسرا

دروستکردن : دروست ک + را = دروستکرا

بڕین : بڕ + ڕا = بڕڕا

گوتن : ب + را = برا

گوتن : گوت + را = گوترا

کوشتن : کوژ + را = کوژرا

پاراستن : پارێز + را = پارێزرا

ناشتن : نێژ + را = نێژرا

... هتد .

بۆ کاتی ئێستا و داهاتوو :

ده + ڕەگی فرمانی تێپەڕ + رێ =

سووتاندن :

ده (ئامرازی کاتی ئێستا) + سووتێن + رێ = دەسووتێنرێ ـ ت

نووسین : ده + نووس + رێ = دەنووسرێ ـ ت

خستن : ده + خه + رێ = دەخرێ ـ ت

... هتد .

کەواته :

ڕەگی فرمان + را = رابوردوو

ده + رەگی فرمان + رێ = ئێستا و داهاتوو

ئەنجام :

١ ـ هەمیشه فرمانەکه تێپەڕ دەبێت .

٢ ـ ئامرازی را + ڕەگی ئەو فرمانه = کاتی رابوردوو

٣ ـ (ده) + ڕەگی فرمان + ڕێ = ئێستا و داهاتوو .

٤ ـ هەمیشە و لە هەموو کاتەکاندا (ڕەگی فرمان) وەردەگرین ٠

٥ ـ هەمیشە ئەو ئامرازە دەلکێنرێت بە کۆتایی ئەو ڕەگەوە ٠

واتە یەکسەر دەتوانین لە ڕابوردووەوە بیکەین بۆ ئێستا و داهاتوو یان بە پێچەوانەوە :

بە گۆڕینی (را) بۆ (رێ) و پێشخستنی ئامرازی کاتی ئێستا (دە) ٠

یان ـ لادانی ئەم ئامرازە و گۆڕینی (رێ) بۆ (را) ٠

**بنکەی دووەم :**

وەك گوتمان پێكدێت بە یاریدەی فرمانی یارمەتیدەری (هاتن) بەم جۆرەی خوارەوە :

١ ـ گۆڕینەوەی فرمانی یارمەتیدەری (هاتن) بە پێی پێویست بۆ کاتەکان ، واتە ئەگەر مەبەست ڕابوردوو دەگۆڕڕێتەوە بۆ رابوردوو و ئەگەر مەبەست ڕانەبوردوو بۆ دەگۆڕڕێتەوە بۆ ئێستا و داهاتوو ٠

٢ ـ مانەوەی ئەو چاوگە تێپەڕەی پێویستە وەك خۆی بەبێ گۆڕینەوە و بە (چاوگی) ٠

بۆ نموونە :

| | ڕابوردوو | ڕانەبوردوو |
|---|---|---|
| نووسین : | هاتە نووسین | دەهێتە (دێتە) نووسین |
| | هاتنە نووسین | دەهێنە نووسین |
| | هاتمە نووسین | دێمە نووسین |
| | هاتینە نووسین | دێینە نووسین |

کەواتە :

نووسرا ـ هاتە نووسین

دەنووسرێت ـ دەهێتە نووسین

فرۆشرا ـ هاتە فرۆشتن

دەفرۆشرێت ـ دەهێتە فرۆشتن

بینرا ـ هاتە بینین

دەبینرێت ـ دەهێتە بینین

... هتد .

پێش کۆتایی هێنان بەم باسە پێویستە ئەمە بزانین :

بۆچی بکەر نادیار دەبێت ؟

چونکە : ـ

١ـ یان بە ڕاستی بکەرەکە نادیارە چونکە کاتی ڕوودانی کارەکە نەبینراوە .

٢ـ یان ـ بکەرەکە دەناسین و دەترسین بە ناسینی زیانی پێ بکەوێتو لە بەر ئەوەی خۆشمان دەوێت دەیشارینەوە و دەری ناخەین .

٣ـ یان لێی دەترسین چونکە یان بە دەسەڵاتە یان بەرانبەر دەترسێنێت ئەگەر ناوی بهێنێت .

٤ ـ یان کەسێکی ناسراو و بەناوبانگ و دەسەڵاتدارە ، بۆ نەشکاندنیو زیان نەگەیشتن بەناو و دوا ڕۆژی دیارناخرێت .

هەر ئەمانەش بۆمان دەردەخەن کە زمان ئاوێنەی کۆمەڵە ...

هەروەها باش لەمە گەیشتن پێویستە لەمەی خوارەوەش بگەن چونکە پەیوەندی هەیە بە باسەکەوە .

---

(●) ئاگاداری ئەو فرمانە تێپەڕە دروستکراوانە بن کە (اندن)یان وەرگرتووە ، چونکە هەمیشە ڕەگەکانیان کۆتایی بە (ێن) دێت و لەبەر ئەوەی لێرەدا ڕەگ وەردەگرین . هەندێک ڕەگ و ئامرازەکان تێکەڵ دەکەن .

جار هەیە خۆمان کارێك دەكەین جار هەیە لە بەر هەر هۆیێك بێت کارەکە بە یەکێکی تر دەکەین ، واتە بە واسیتەی یەکێك یان لایێکی تر لەبەر چەند هۆیێك کە ئەوانەی سەریشەوە دەگرێنەوە تا ڕادەیێك ئەو واسیتەیەش کە لە ڕستەدا (بکەر)ی ڕاستەقینەن دەرناخرێنو دەشاررێنەوە ٠

بۆ نموونە :

فرۆشتن : فرۆشرا ــ درا بە فرۆشتن ٠

باغەکەم فرۆشت ، فرۆشرا ، دەفرۆشرێت ٠

باغەکەم دا بە ناسیاوەکــەمان بۆم بفرۆشێت ، دەدرێت بە فرۆشتن ، درا بە فرۆشتن ٠

(دا) بناغەی چاوگی (دان) و (دە) ڕەگی فرمانــەکەیەتیو تێپەڕیشە ، لێرەشدا دووبارە(ڕەگێ)وەردەگرین + (ڕا)و(ڕێ)٠ بەپێی پێویست ٠

نووسین : نووسرا ، درا بە نووسین ٠

دەنووسرێت ، دەدرێت بە نووسین ٠

دروون : دروورا ، درا بە دروون ٠

دەدروورێت ، دەدرێت بە دروون ٠

هــەروەك بنکــەی دروست کــردنی فرمانی بکەر نادیار بە یاریدەی فرمانی یارمەتیدەر ٠

فرمانە یارمەتیدەرەکە (واسیتە)کــە پێش فرمانە بنجییەکە دێتو ئەو ئامرازەکــان وەردەگرێت و دەلکێن پێیەوە و فرمانە پێویستو مەبەستەکە بە چاوگی دەمێنێتەوە،تەنیا ئامرازی (بە)ی پێش دەخرێت ٠

## فەسڵی حەوتـــــەم

## ئاوەڵـــکار

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخافتن ، کەواتە وشەیە ، بەڵام بە پێی خاسیەت و دەوری لـە زمـان و رستەدا لـە وشـەکانی‌تر جودا دەکرێتەوە ٠

ئاوەڵکار ئـەو زەرفەیە کە ڕووداوەکەی تێـدا ڕوو دەدات واتە دەبێت بـە (زەرف)(*) بۆی یان ئەو چوارچێوەیـەی دەوری دەدات ، جا شـوێن بێت یـان کات بێت یـان حـاڵ و هەیئەتێکی تایبەتی بێت ٠

ئاوەڵـکار وەك زاراوە بـە تـەواوی لەگـەڵ مەبـەست و ناوەرۆکیدا گونجاوە و زاراوەیێکی لێکدراوە پێکهاتووە لە :

وشەی ئاوەڵ (هەڤاڵ) (هەواڵ) + کار (فرمان) = ئەوەی کە لەگەڵ کاردا دێت ، هەر وەك ئاوەڵناو ، کە لەگەڵ ناودا دێت و وەسفی دەکات و ڕوونی دەکاتەوە ٠

بەو پێیە ئاوەڵکار دەبێت بە :

**١ ـ ئاوەڵکاری کات :**

بە ناوەکەیـدا دیارە کـە بەیـانی ئـەو کاتـە دەکات کە فرمناەکەی تێـدا ڕووی داوە ٠٠٠ واتـە وەڵامی ئـەم پرسیارە دەداتەوە :

چ کاتێك فرمانەکە یان کارەکە ڕوویدا ؟

بۆ نموونە :

ڕۆژی هەینیی داهاتـوو پشووی هاوین دەست پێـدەکات و

دەرۆمەوە بۆ ماڵەوە ٠

کاتی ڕۆیشتن (هەینی)یە ٠

ئەمشەو تا فـەرداهی ڕۆژ بۆتەوە ئەو نەخۆشـە وەنەوزی نەداوە ٠ نەنووستووە لە کەیێکەوە ؟

لە شەوێوە تا بەیانی ٠

ئەم ئاوەڵکاری کاتە وەك دەرکەوت وەڵامی دەداتەوە ٠٠٠٠

کەی ؟ : بەیانی ، نیـوەڕۆ ، ئێوارە ، شـەو ، نیوەشـەو ، بەرەبەیان ، پێش‌نیوەڕۆ ، بەهار ، هاوین ، زسـتان ، پایز ، هەینی ، دووشەمە ، ئێستا(هەنووکە)، هەرئێستا تائێسـتا ، لەئێسـتاوە ، هەمـوو ڕۆژێك ، سـۆزی ، ئێواران ، چێشتەنگاو ، دوای‌نیوەڕۆ ، دوێنێ ، پێرێ ، ئەمشەو ، دەست‌بەجێ ، مانگ ، هەفتە ، ساڵ ، سەدە ، درەنگ ، زوو ، خێرا ، هەمیشە ، جارجار ، کتوپڕ ، ( لە ناکاو ) دیسان ، پێـرار ، لەمەوبەر ، لەمەوبـەر ، لەمەوپاش هتـد ٠٠٠

**ڕاهاتن :**

١ ــ چ ئاوەڵکارێك لێرەدا نەهاتۆتەوە باسیان بکە و بیـان خەنە پاڵ ئاوەڵکارەکانی سەرەوە ٠

٢ ــ هەر یەکە لەو ئاوەڵکارانە بخەنە ڕستەیێکی پتەو و پاشەوە ، باشتریشە ئەگەر لە گفتوگۆی ڕۆژانەی باودا ، لە پـەندی پێشینانداا ٠

٣ ــ لیستەیێك بکەن بۆ هەر ئاوەڵکارە و هاوواتاکەی ٠

٤ ــ لیستەیێك بۆ هەر ئاوەڵکارە و دژواتاکە ٠

٥ ـ پرسیارێك دابنێن و هەوڵ بدەن بە هەموو ئەو ئاوەڵکارانە وەڵامی (کەی) بدەنەوە و پاشان بڕوانن :

أ ـ بە لادانی (کەی) چی جێگەی دەگرێت ؟

ب ـ ئایا لە گشت رستەکاندا تەنیا ئاوەڵکارەکە ئاڵوگۆڕی بە سەردا دێت یان نا ؟ •

٦ ـ هەندێك لەمانە :

جارێك ، گەلێك ، تۆزێك ، هەنـدێك ، نەختێك ، کەمێك ، بڕێك ، چۆرێك ، پێچێك ، جـارجار ، تـاوتاو ، دەمدەم ، کەمکەم ، وردە وردە ، تۆزە تۆزە ، هەمیشە ، زۆر (فرە) ، ئەوەندە •

ناو دەنێن (ئاوەڵکاری چەندی) پێش وەڵامدانەوە :

١ ـ بەراوردییان بکەن لە ئاوەڵکارەکانی کات •

٢ ـ هەر یەکە بخەنە رسـتەوە و لێکی بدەنەوە ئینجـا لە ئەنجامدا وەڵام بدەنەوە (بۆ)و راستە یان نا ؟

٧ ـ بۆ ئەم باسە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەیێك یان زیاتر•

## ٢ ـ ئاوەڵکاری شوێن :

دیارە هـەروەك ئاوەڵکاری کات کـاتی ڕوودانی کـارەکە دەردەخات ، (ئاوەڵکاری شوێن) شوێنی ڕوودانی ئـەو ڕووداوە پیشان دەدات

بۆ نموونە :

شوانەکە لە (ژێر) دار ئەرخەوانەکەدا نوستووە •

شاخەوان لە (سەر) لوتکەی شاخەکە بۆی دانیشتووە •

لەو ڕستانەدا ژێر و سەر بەیانی ئەم جێو شوێنە دەکەن کە (شوان) و (شاخەوان) لێی نوستوون و دانیشتوون ·

دەڵێین (لە کوێ) نوستووە ؟

شاخەوان (لە کوێ) دانیشتووە ؟

کەواتە (لە کوێ) بە ئاوەڵکاری شوێن وەڵام دەدرێتەوە ، کە ئەمانەن :

سەر (بان) ، ژێر (بن) تەنیشت (لا ، کن ، نك) ، ناو ، ڕاست ، چەپ ، پێش (بەر ، بەردەم ، پاش «دوا» ، پشتاوپشت ، پاشەوپاش ، دوور ، نزیك ، خوار ، ژوور ··· هتد) ·

**ڕاهێنان :**

١ ــ چ ئاوەڵکارێکی شوێن لێرەدا نەهاتۆتەوە دایانبنێن ·

٢ ــ هەر یەکە بە تەنیا بخەنە ڕستەوە ·

٣ ــ لیستەیێك بۆ ئاوەڵکارە هاوواتاکان بکەن ·

٤ ــ لیستەیێك بۆ ئاوەڵکارە هاودژەکان بکەن ·

٥ ــ ئەو ئاوەڵکارانە بخەنەوە ڕستە یان لە ژمارە (٢)ی سەرەوە وەری‌بگرن ، پاشان ئەو ڕستانەی ئاوەڵکاری هاوواتایان تێدا جێگۆڕکێ بە ئاوەڵکارەکانی بکەن بزانن بە تەواوی جێگەی یەك دەگرنەوە و بەبێ دەستکاری یان نا ؟

هەمان شت بۆ ئاوەڵکارە دژەکان و بزانن بە تەواوی عەکسی یەکن یان نا ؟

٦ ــ ڕستەیێك دروست بکەن بۆ پرسیاری (لە کوێ) و بەو ئاوەڵکارانە وەڵامی بدەنەوە و ئەنجامەکە خۆتان بینووسن ·

٧ ــ بەراوردیی ئەم باسە لەگەڵ باسی کتێبێك بکەن و ڕای خۆتان بە شێنەیی وردی دەربخەن ٠

## ٣ ــ حاڵ (یان ئاوەڵکاری وەسفی) پێ دەڵێن :

ئەم ئاوەڵکارە وەسفی‌یانە بەیــانی حاڵ و ئەحواڵی خاوەن کارەکە ڕوون دەکاتەوە ٠

کەواتە :

ئاوەڵکاری کات ــ کاتی ڕوودانی کار

ئاوەڵکاری شوێن ــ شوێنی ڕوودانی کار

ئاوەڵکاری وەسفی (حاڵ)ی ئەو کەسە بەیــان دەکات کاتی ڕوودانی کارەکە یان ڕوونەدانی ٠

**ئاوەڵناو :**

وەڵامی (چۆنــە ــ چۆن بــوو ــ چۆن دەبێت) دەداتــەوە بە گشتی ٠

**حاڵ[*] :**

وەڵامی (چۆن) دەداتەوە بە گشتی ٠

بە ڕاکردن هات ــ چۆن هات ؟

بە پەلەپەل ڕۆیشت ــ چۆن ڕۆیشت ؟

ئەگەر ســەرنج بدەین دەبینین لە پێش هــەر ئاوەڵکارێکەوە ئامرازی (بە) هەیە کە پێشی دەگرێت بەبێ (بە) ڕوون نابێتەوە یان (لە) ٠

لەو ئاوەڵکارانە :

بە پێکەنین ، بــە گریان ، بە هەڵەداوان ، بە گــەرمی ، بە

---

(●) لە عەرەبیدا ڕستەیێك ژمارەی تێدا بێت (تمییز) و ئەم ئاوەڵکارەی تێدا بێت (حاڵ)ی پێدەگوترێت ٠

ساردی ، بە گورجی ، بە شپرزەیی ، بە گورِ ، بە دڵشکاوی ، بە کوڵ ، بــە سکەخشــکێ ، بە ترس‌ولــەرز ، بــە شــەرمەوە ، بە خۆشییەوە ، بە ســەربەرزی ، لە ترساندا ، لە شــەرماندا ، لە خۆشییاندا ، بە پەلە پرووزێ ، بە پێ ٠

**ڕاهێنان :**

١ ــ هەوڵی کۆکردنەوەی ئەو ئاوەڵکارانە بدەن کە لێرەدا نین بە گەڕان بە ناو سەرچاوەکاندا کە لەم باسە دواون ٠

٢ ــ هەر یەکە بخەنە ڕستەیێك زیاتر ٠

٣ ــ پاشان لە جێی (بە) ، (لە) دابنێن و بزانن چ ئاڵوگۆڕێك بە سەر ئەو ڕستانەدا دێت لە ڕوواڵەت و ناوەرۆکدا ٠

٤ ــ هاوواتــا و دژواتــاکان جودا بــکەنەوە و لــە ڕێگەی ڕستەوە بەراوردیان بکەن لە ناو خۆیاندا ٠

٥ ــ هەموویان بکەن بە وەلاّم بۆ ڕستەیێك کە (چۆن)ی تێدا بێت و بزانن دەگونجێت یەکسەر بە لادانی (چۆن) و دانانی ئەو ئاوەڵکارانە لە جێگەی ٠

٦ ــ ئەمانە چین :

ئا ، نا ، بەڵێ ، نەخێر ، ئەرێ ، باشە ، ڕاستە ، دروستە ، خراپە ، هیچە ، جوانە ٠

**تێبینی :**

١ ــ هەر ڕستەیێك ئاوەڵکاری تێدا بێت وەك هەر ڕستەیێکی تر هەروەك بۆ ڕوودان بەکار دێت ، ڕوونەدانیش سروشتێتی :

لە بەهاردا هات ــ کەی هات ؟

بەهار هات و ڕۆی ئەو هەر نەهات ٠

هەموو چوونــە ناو بێستانەکە بۆ ڕابواردن و گــەڕان ئەو نەچوو (نەچوو بۆ ناو بێستانەکە ، چوو لە ژێر درەختێکدا پاڵی لێدایەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوە ٠

٢ ـ هەر وەك دەگونجێت ئاوەڵکارەکە دووبارە بکرێتەوە ، واتە دوو دوو بەکار بێت ، وەك :

ناوەناوە (جارجار) دەیبینم ٠

کەمکەم لە ماڵ دەچمە دەرەوە ٠

دەگونجێت دوو دووش ئاوەڵکاری جودا بخەینە پاڵ یەك ، وەك :

(ئێوارەی شەممە) کۆبوونەوەمان هەیە ٠

(شەوی زستان) درێژ و خۆشە ٠

(زۆر زوو) گەڕایەوە ٠

٠٠٠ هتد ٠

## بەشی هەشـــتەم

## ژمارە لە زمانی کوردیدا

ژمارە ، لەهەموو زمانێکدا هەیە نیشانەکانی دیارە واتە بۆ هەر یەکە نیشانەیێك دانراوە لەوی‌تر جودای دەکاتەوە لە (١)ەوە تا (٩) ٠

پاش ١ تا ٩ هەریەکە خاڵێکی دەخرێتە پێش و دەبێت بە سەر ژمارە (١٠ ، ٢٠ ، ٣٠ ، ٤٠ ، ٥٠ ، ٦٠ ، ٧٠ ، ٨٠ ، ٩٠) هەر

یەکە لەمانە دەری دەخات کە ئەوەندە ژمارە (١)ی تێدایە ۰۰۰۰ پاشان خاڵ دەبێت بە دوو (١٠٠ ، ٢٠٠ ۰۰۰ هتد) ، بە سێ (١٠٠٠) هەروەها تا دوایی و بە پێی پێویست ۰

پاشان لە چەپەوە بۆ ڕاست ژمارە لە کوردیدا دەنوسین و دەخوێنینەوە ، وەك ١٢٩ ، بەو جۆرە ژمارە دەنووسین و بە پێی پێویست ریزیان دەکەین ۰ ئەمە ژمارە ۰

بەڵام ناوی ژمارە : بە گۆڕینی ئەو نیشانە بۆ نووسین بە پێی دەرچوونی لەدەم ، دەگوترێت ناوی ژمارە وەك (١) = یەك ، ١٠ = دە ، ١٠٠ = سەد ، ٢٢٢ = دوو سەد و بیست و دوو هتد۰

ناوی ژمارەش وشەیە ، واتە یەکێکە لە بەشەکانی ئاخافتن بەڵام لەبەر هەندێك خاسیەتی تایبەتی لە ناوی ژمارە و چۆنێتی بەکارهێنانی و دابەشکردنی بە چەند شێوەیێك و وەرنەگرتنی نیشانەی کۆ وەك ناوی تر ،تەنیا لە هەندێك حاڵاتدا نەبێت وەك: حەوتەکان واتە ئەو شتەی کە حەوت دانراون بۆیە بە تەنیا دانراوە هەروەك لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە ۰۰۰

پاش باسکردنی ژمارە بۆ ئاسانی یەکسەر دێینە سەر بەشەکانی ژمارە ۰

## ژمارەی ریشەیی

ئەو ژمارەیەیە کە کەرتی تێدا نیە وەك : ( یەك ، چوار ، سی ، حەفتا ، هەشتا )۰۰۰

لە ڕستەدا پێش وشەی باسکراو دەکەوێت ئەوەی تووشی سوورێژە بێت چل رۆژ پارێز دەکات، مانگێ هەیە سی رۆژەو هەیە سێویەك ، هەشە بیستونۆ ڕۆژە ۰۰۰ بەڵام تەمەنی مرۆڤ

نازانرێت ، چەند ساڵ ، یان چەند مانگە ...

١ ـ لەگەڵ ناوە ، باسکراوەکە (کە) وەرناگرێت ، بەڵام کە لابرا (کە)ی دەچێتە سەر وەك :

دە هێلکەکەم خستەوە شوێنی خۆی .

دەکەم خستەوە شوێنی خۆی .

واتە ئەگەر ناو دەرکەوت (کە) دەچێتە سەر ناوەکە ئەگەر نەبوو دەچێتە کۆتایی ژمارەکە ...

٢ ـ ناوە (باسکراوەکە) لەگەڵ ئەم ژمارەیەدا کۆناکرێتەوە واتە نیشانەی کۆی ناچێتە سەر بەڵکو هەمیشە تاکە .

پەنجا گۆڤارم هەیە .

پازدە سێو بە درەختەکەوە ماوەتەوە .

کەواتە ژمارەی ریشەیی ژمارەی تاك دەگرێتەوە کە لە (١) تا (٩)و سەر ژمارە تاکەکان کە بریتیە لە (١٠) (٢٠) تا سـەد (١٠٠) ، ١٠٠٠ ، ملیون ...

## ژمارەی تەرتیبی

## ژمارەی ڕیکخـــــــــرو

بەو ژمارانە دەگوترێت کە بە پاریدەی ( م ) (مین) ژێریان نیشانە دەکرێت و لە ژمارەی ڕیشەیی پێكدێن ، وەك :

١ ، یەك ، یەکەم ، یەکەمین .

٤ ، چوار ، چوارەم ، چوارەمین .

ئەگەر وشەکە کۆتایی بە پیتە بزوێـن هاتبوو بڕگەی (یە)

دەکەوێتە نێوانیان ، وەك :

٧ ، حەوت ، حەوتەم ، حەوتەمین ٠

٧٠ ، حەفتا ، حەفتایەمین ، یان : حەفتاهەمین ٠

لەڕستەدا پاش و پێش دەکەون وەك :

چوارەمین جار ، جاری چوارەمین دۆزیمەوە ٠

رۆژی شەشەم ، شەشەمین رۆژ گەڕایەوە ٠

سەرنجی ناو باسکراوەکە تاکە ٠

## ژمارەی تەوزیعی

ئەو ژمارەیەیە کە ژمێرراوەکە وەك یەك یەك لە ڕستە و گفتوگۆکردندا باس دەکات بە دووبارەکردنەوەی ژمارەی ڕیشەیی ، واتە بە یاریدەی ئەم ژمارەیە پێكدەهێنرێت ، وەك :

یەکە یەکە وەرنە ژوورەوە ٠

یەك بە یەك سەیرم کردو ، تاقیم کردنەوە ٠

## ژمارەی کەسری ٠

بەو ژمارانە دەگوترێت کە وردیی ژمێرراوکە دەردەخات وەك :

سێیەکی پارەکەم دەست نەکەوتەوە ٠

چواریەکی ئەوسا ناخوێنمەوە لەبەر کار ئەمە پێك دێت لە : ژمارە پێویستەکە + ئەو بەشەی پەیوەندیی پێوەیە

**هەشت یەك ، هەشت بە یەك ٠**

یەعنی یەك لە هەشت ، ١ / ٨

(●) چارەك ــ چواریەکە ــ ربع ٠٠ لە عەرەبیشدا بۆ ڕوونکردنەوەی کاتژمێر بەکاردێت ، کەواتە کورتکراوەتەوە ٠

## ئەنجـــام :

ژمارە پەیدابــوون بێگومــان بۆشاییەکی گرنگی لــە زمان پڕکردەوە و هەنگاوێکی باشی نا لە پەرەسەندن و ڕوونکردنەوەی مەبەست بە شێوەیێــکی زۆر ورد و ئاشــکرا • بۆ ئــەوەی زۆر لەسەر ئەمە نەڕۆین لە خۆمان دەپرسین ڕۆژی چەند جار ژمارە بە جۆرەها شێوە بەکار دەهێنین ، بار و ژیانی ئابوری ئەمڕۆ و دوا ڕۆژی بە چی ڕوون دەکرێتەوە ••• با ژمارە لە ژیان و لە زمان بکەینە دەرەوە لــە ڕۆژێکی ژیانمــان بکەینــە دەرەوە چی ڕوو دەدات ؟

ژمارە وەك بۆمــان ڕوون بــووەوە بە چەند جــۆر و چەند شێوەیێك بــەکار دێت ، هەر یەکە جێ و شــوێن و تایبەتێتی و دەوری خۆی هەیە ، هیچیان زیاد نین و هیچ کامێکیان بێ سوود دەرنەکەوتووە •

ئەوەی تا ئێستا هەیە و باوە ئەم جۆرانەن ، کە لە ژیانی ڕۆژانەی هەر یەکێکدا دەوری خۆی دیوە و دەبینێت :

١ ــ وێنەی ژمــارە ، کە ڕەمز و نیشانەن بۆیــان نووسینی ئاسانە و ماوەی زۆر کەمتــری دەوێت وەك لە نووسین بۆیە ئەو نیشانانە شوێنی خۆیان هەیە کە وێنە جێیان ناگرێتەوە •

بەڵام لەگەڵ یەکدا بەکار دێن بۆ چەسپاندن و ڕێ نەدان بە یاریکردن بەو نیشانانە ، وەك :

٤٥/چل و پێنجی وەرگرتووە لە پەنجا •

١٠٤ سەد و چوار •••

٢ ــ نووسینی ئــەو ژمارانە ، واتە گۆڕینیان لە نیشــانە و ڕەمزەوە بۆ وێنە و نووسینێکی دیار •

یەك(*) (١) ٠

دە (١٠) ٠

ئەم وێنەی نووسینەش شێوەیێکی زیاتر هەیە بۆیە بەو پێیە دابەش‌کراون و ناونراون :

## ١ ـ ژمارەی ڕیشەیی :

کە ژمارە تاك سەد گرێی (سەد ژمارەی) تاك دەگرێتەوە ٠٠ وەك :

شەش ، بیست ، پەنجا ، سەد ٠٠٠٠

سەرنجی دەوری ئەم ژمارەیە بدەن لە شوێنی تردا ٠٠٠

## ٢ ـ ژمارەی ڕێکخراو (تەرتیبی) :

بە یاریدەی (م) و (مین) و پیتی پێوەندی (ە)کە دەکەوێتە نێوانی ئەمانە و ژمارەکە :

ژمارە + پیتی پێوەند + (م) یان (مین) ٠

حەوت + ە (یە) + م = مین = حەوتەم ، حەوتەمین ٠

جیاوازیی نێوانی ژمارەی ڕیشەیی و ڕێکخراو :

سەرنجی ئەم دوو نموونەیە بدەن :

تا ئێستا (دە) جار چووم بۆ لای ٠

دەیەم جار چاوم پێی‌کەوت ٠

یەکەم : ژمارەی کارەکە ڕوون دەکاتەوە ٠

---

(*) ئەم ژمارەیە لەوەش چۆتە دەرەوە بۆ دروست‌کردن و یارمەتیدانی دروست‌بوونی بنکە بۆ کردنی ناو بە نەناسراوی تاك لە ناوێکی گشتیەوە . کە جار هەیە بە ئەنقەست دەکرێت بە نەناسراو لەبەر هەر هۆیێك بێت . پەیوەندیی نێوانی ئەم ژمارەیە و ئەو مەبەستە بووە هۆی ئەم هەنگاوە نوێیە لە زماندا دروست ببێت ، بۆ نموونە : یەك ساڵ ، ساڵێك ، لە یەکەمدا ژمارەیە ، لە دووەمدا ئامرازە ، سەرەڕای دروست‌کردنی مەبەستی تریش وەك : یەکسەر ، یەکجار ٠٠٠ هتد ٠ بگەڕێرەوە بۆ ئەم باسە ٠

دووەم : ئـەو ژمارەیە دەستنیشان دەکات کە بـووە هۆی گەیشتن بە مەبەست •

کەواتە هـەر یەکـە دەوری خۆی هەیـە ، بـەڵام (م=مین) هاومەبەستن •

لەگەڵ ژمێرراودا پاش و پێش دەکـەون و ناوەکە بـە تاکی دێت ، بەبێ هیچ گۆڕڕانێك وەك :

یەکەم جار ، جاری یەکەم (ی) دەیانبەستێت پێکەوە •

**ژمارەی دابەشکراو (توزیعی) •**

لە دووبارەکردنەوەی ژمارەی ڕیشەیی دروسـت دەبێت •

بۆیە پێی دەگوترێت دابەشکراو چونکە ، وەك یەك دابەش دەبن و کارەکە بە شـێوەیێکی ڕێك و پوخت دوا بە دوای یـەك دەسازێنێت •

یەك یەك ، دە دە ، بیست بیست ، دەشگوترێت یەك بە یەك ، دە بە دە •

جار هەیە لە جێی یەك و جاریش هەیە هەندێك جیاوازن و هەر یەکە بۆ شوێنێك بەکار دێت وەك :

دوو دوو ناردمن •

دوو بە دوو ناردمن •

لە یەکەمـدا کارەکەی بەو شێوەیە و بەو ژمارەیەو یەك لە دوای یەك بردە سەر •

لە دووەمدا نەك دوو پاشان دوو •

بەڵکو دوو بـەرانبەری دوو دەکاتە چوار ، ئەمە هەروەك لە

ژمارەی ڕێکخراودا هەیە لە وشەی تریشدا بەکاردێت (هەر چەندە ژمارە وشەیە و یەکێکە لە بەشەکانی ئاخافتن و دەری دیارە لـە ڕستە و زماندا) ٠ ٠ ٠ وەك : دەستـە دەستە ، کۆمەڵە کۆمەڵ ، بەرە بەرە ، تۆزە تۆزە ، ییواش ییواش ، دەنگ دەنگ ، توێ توێ هەپروون هەپروون ، پارچە پارچە هتد ٠٠٠ خۆت لێکیان بدەوەو بەراورد دیان بکە ٠

**ژمارەی کەسری ٠**

بەو ژمـارانە دەگوترێت کـە وردی یان بەشە وردەکانی ژمێرراوە کە دەردەخات ، پێك دێت لە :

ناوی ژمارەکە + بەشە وردەکەی کە(یەك)ە ٠

چوار + یەك = چواریەك ٠

وەك : سێیەکی پارەکەم دەست نەکەوتەوە ٠

چواریەکی ئەوسا ناخوێنمەوە لەبەر کار ٠

هەشت یەکی باغەکەمان دار هەنارە ٠

بەنیشانە = سێیەك = ٣/١ ٠

چواریەك = ٤/١ ٠

هەشتیەك = ٨/١ ٠

ئەگـەر مەبەست بەشـە کەمەکەبوو دەکەوێتە دوای ژمارە تەواوەکە ، یان ئەو ژمارەیەی مەبەستەبەگشتی دەکەوێتە دواوە ٠

کە دەڵێین سێیەك یەعنی کەرتێك لەسێ بەش ٠

کـەدەڵێین سێ بەش یـان سێ چـارەك یەعنی سێ بەش لە چواربەش ٠ ٠ ٠ ٠

دەشتوانین بڵێین : سێیەك = سێ بەیەك ٠
چواریەك = چوار بەیەك ٠
هەشت یەك = هەشت بەیەك ٠

کەواتە ژمارەی کەسری دەوری هەیەلەدەرخستنی کەرتەکانی ژمارە ، کە لایەکیان بەشێك لە ژمارەی بە شەکەیتر ، بەڵام ئەگەر هەردوو وەك یەك بوون دەگوترێت چوار بە چوار = هەشت یان نیو بە نیو ، یەعنی (هەشت) ە کرا بە دوو بەشەوە یان‌نیو سەعات نیوی یەك سەعات ، هەروەك چارەك یەك لە چواری سەعاتێك ٠ ٠ ٠ هتد ٠

ژمارە ٠

## نووسینی ژمارە لە (١١) ەوە هەتا (١٩) ٠

ئەگەر لە چۆنێتی پێکهاتن و بەکارهێنانی ژمارەکانی کوردی بگەین بە تایبەتی لە (١١) ەوە هەتا دەگاتە (١٩) ، دەبینین چەند گۆڕرانێك بە سەر ڕوواڵەتیاندا هـاتووە و لە ناوچە بۆ ناوچە بەچەند شێوەیێك دەردەبڕرێن و دەنووسرێن ٠

بۆ نموونە ئەگەر ژمارە (١١) ەوەرگرین : هەن دەڵێین = ٠
(یازدە) وهەن دەڵێین (یانزە) ٠
ژماە (١٢) ە :

پاش وردبوونـەوە و لێکۆڵینەوە دەبینین بـە پێنج جۆر لە کوردەواریدا بەرگوێ دەکەوێت کە ئەمانەن :

دوانزدە ، دوانزە ، دوانگزە ، دوانگزدە ، دوازدە ٠
ژمارە (١٣)ە دەبێت بە : سیانزە ، سێزدە ٠

ژماره (١٤) چوارده ٠

ژماره (١٥) پانزه ، پازده ٠

ژماره (١٦) شانزه ، شازده ٠

ژماره (١٧) حه‌ڤه (حه‌ڤڤه) ، حه‌ڤده ٠

ژماره (١٨) هه‌ژده ٠

ژماره (١٩) نۆزده ٠

پێش ئه‌وه‌ی بلێین کامیان ڕاسته و چ گۆڕراتێك به‌سه‌ریاندا هاتووه و بۆ ، بـا هه‌ندێك له لای ئه‌م ژماره جووتانـه بوه‌ستین بزانین له چی و چی پێکهاتوون :

دیاره که پێکهاتوون له ژماره (١) تا ده‌گاته (٩) + ژمـاره (١٠) = (٥) واته :

یه‌ك + ده

دوو + ده

سێ + ده

چوار + ده

پێنج + ده

شه‌ش + ده

حه‌وت + ده

هه‌شت + ده

نۆ + ده

ده‌مێنێته سه‌ر (ان) له‌گه‌ڵ (ز) که له ده‌ربڕینی به‌شێکیاندا ئاشکرایه و له هه‌ندێکی تردا نیه ٠

١ ـ (ان)(*) : لێـرەدا وەك دەردەكـەوێت (ان) نیشـانەی ژمارەی دابەش‌كردنە (تەوزیعی) نەك ئامرازی كۆ ٠

٢ ـ (ز) لەوانەیە كورت‌كراوەی (نیز) بێت كە لە فارسیدا بەكار دێت وەك ئامرازی بەستنەوە (عطف) ٠

٣ ـ گۆڕینی (د) بۆ (گ) لێرەدا دیارە و شتێكی نوێ نیە چونكە لە شوێنی تریشدا ئەم دوو دەنگە ئاڵوگۆڕ دەكەن ، وەك :

مەند : مەنگ ٠

پەند : پەنگ ٠

٠٠٠ هتد ٠

٤ ـ فـڕێدانی (ان) ئاشـكرایە كـە لەبـەر قورسـییە بۆ تاقی‌كردنەوە بەكاریان بهێنە لەگەڵ (ان) یان لەگەڵ پیتی (ن) لە (ان)دا : سیانزدە ـ یازدە ٠ هەروەها ئەوانی‌تر ٠

هەمان شت دەڵێین دەربارەی ژمارەكانی‌تر ، كەواتە بەم پێیە ژمارەكان نووسینیان بەم شێوەیەی خوارەوە ڕاستە بۆیە پێویستە بچەسپێنرێت لە نووسین و خوێندندا بۆ پاراستنیان و یەكێتی لە نووسین و خوێندندا :

| ژمارە | نووسینی |
|---|---|
| ١١ | یازدە |
| ١٢ | دوازدە |
| ١٣ | سێزدە (سیازدە) |
| ١٤ | چواردە (چوار + دە) |
| ١٥ | پازدە (پا ـ كورت‌كراوەی پێنجە) |

(●) (ان) لە گەلێك شوێن بەكار دێت ، لێرەدا ماوەی باس‌كردنی نیە ٠

١٦ شازده (ش کورتکراوەی شەشە)

١٧ حەڤدە (هەڤدە) (حەفت + دە)یە بەڵام دەربڕینی (ت) و (د) لەگەڵ یەك قورسە بۆیە (ت) قووت دراوە و (ف) زیاتر لەگەڵ (ت)دا دەگونجێت وەك لە (د) کە لەگەڵ (ڤ)دا ڕێکە ٠

١٨ هەژدە (هەشت + دە)یە ، لەبەر هەمان هۆی سەرەوە و گونجانی (ژ) لەگەڵ (د) (ش) بووە بە (ژ) ٠

١٩ نۆزدە(*)

لە (٢١)ەوە تا (٩٩) بە پێچەوانەی عەرەبییە و وەك ئینگلیزی و تورکی و ڕووسییە ، ژمارە گەورەکە پاشان بچووکەکە بەم جۆرەی خوارەوە :

| ژمارە | وێنەی نووسین |
|---|---|
| ٢٠ | بیست |
| ٢٢ | بیست و دوو |
| ٢٣ | بیست و سێ |
| ٢٤ | بیست و چوار |
| ٢٥ | بیست و پێنج |
| ٢٦ | بیست و شەش |
| ٢٧ | بیست و حەوت |
| ٢٨ | بیست و هەشت |
| ٢٩ | بیست و نۆ |

(*) لە (١١) تا (١٩) وەك عەرەبی دەخوێنرێتەوە ٠

| | |
|---|---|
| ٣٠ | سی |
| ٣١ | سی و یەك |
| ٣٢ | سی و دوو |
| ٣٣ | سی و سێ |
| ٣٤ | سی و چوار |
| ٣٥ | سی و پێنج |
| ٣٦ | سی و شەش |
| ٣٧ | سی و حەوت |
| ٣٨ | سی و هەشت |
| ٣٩ | سی و نۆ |
| ٤٠ | چل |
| ٤١ | چل و یەك |
| ٤٢ | چل و دوو |
| ٤٣ | چل و سێ |
| ٤٤ | چل و چوار |
| ٤٥ | چل و پێنج |
| ٤٦ | چل و شەش |
| ٤٧ | چل و حەوت |
| ٤٨ | چل و هەشت |
| ٤٩ | چل و نۆ |
| ٥٠ | پەنجا |

| | |
|---|---|
| ٥١ | پەنجا و یەك |
| ٥٢ | پەنجا و دوو |
| ٥٣ | پەنجا و سێ |
| ٥٤ | پەنجا و چوار |
| ٥٥ | پەنجا و پێنج |
| ٥٦ | پەنجا و شەش |
| ٥٧ | پەنجا و حەوت |
| ٥٨ | پەنجا و هەشت |
| ٥٩ | پەنجا و نۆ |
| ٦٠ | شەست |
| ٦١ | شەست و یەك |
| ٦٢ | شەست و دوو |
| ٦٣ | شەست و سێ |
| ٦٤ | شەست و چوار |
| ٦٥ | شەست و پێنج |
| ٦٦ | شەست و شەش |
| ٦٧ | شەست و حەوت |
| ٦٨ | شەست و هەشت |
| ٦٩ | شەست و نۆ |
| ٧٠ | حەفتا |
| ٧١ | حەفتا و یەك |

| | |
|---|---|
| ٧٢ | حەفتا و دوو |
| ٧٣ | حەفتا و سێ |
| ٧٤ | حەفتا و چوار |
| ٧٥ | حەفتا و پێنج |
| ٧٦ | حەفتا و شەش |
| ٧٧ | حەفتا و حەوت |
| ٨٧ | حەفتا و هەشت |
| ٧٩ | حەفتا و نۆ |
| ٨٠ | هەشتا |
| ٨١ | هەشتا و یەك |
| ٨٢ | هەشتا و دوو |
| ٨٣ | هەشتا و سێ |
| ٨٤ | هەشتا و چوار |
| ٨٥ | هەشتا و پێنج |
| ٨٦ | هەشتا و شەش |
| ٨٧ | هەشتا و حەوت |
| ٨٨ | هەشتا و هەشت |
| ٨٩ | هەشتا و نۆ |
| ٩٠ | نەوەد |
| ٩١ | نەوەد و یەك |
| ٩٢ | نەوەد و دوو |

٩٥ نەوەد و پێنج

٩٦ نەوەد و شەش

٩٧ نەوەد و حەوت

٩٨ نەوەد و هەشت

٩٩ نەوەد و نۆ

١٠٠ سەد

ئیتر بەم بێیە تا دەگاتە گەورەترین ژمارە واتە : ژمارەی گەورە + و (پێوەند) + ژمارەی بچووك ٠

سی + و + هەشت ٠

حەفتا + و + نۆ

سەد +و + یەك = ١٠١

دوو + سەد + و +دوو = ٢٠٢

هەزار + و +سەد و + پێنج = ١١٠٥

شەش هەزار + و + حەوتسەد + و + چل + و + چوار = ٦٧٤٤ هتد ٠ ٠ ٠

ئەنجام :

١١ تا ١٩ (بەیاردەی(ان) ونیز) لەهەندێکیاندا ٠

باش کورت کردنەوەیان ٠

ژمارەی بچووك + گەورە

لە ٢١ تا ژمارە کانی تر

گەورە + بچووك بەياريدەی (و) ی بەستنەوە ٠

## بەشی نۆيەم :ــ

**ئامراز**

١ــ پێناسينی ئامراز ٠

٢ــ چەند جۆرن ٠

١ ــ نەفی و نەهی كردن ٠

٢ــ بۆ دروست كردنی بنكە ڕێزمانی (نووسرا ، دەم نووسی) ٠

٣ ــ بۆ بەستنەوەی وشەكانی ڕستە بە يەكەوەو ڕونكردنەوەی مەبەستەكانی ٠

٤ ــ بۆدەرخستنی حاڵی‌يان ئەو (مفهوم) ومەبەستانەی ڕستە دەی گەيينێت ٠

ئامراز هەيە :

بەتەنيا دەنووسرێت ٠

هەيە دەلكێت بە پاش و پێشی وشەوە ٠

هەيە دەكەوێتە سەرەتای ڕستە ٠

هەيە دەكەوێتە ناوەڕاست ٠

هەيە دەكەوێتە پاش ٠

هەيە لە شوێنێك زياتر بەكاردێت ٠

هەيە پێكەوە لە ڕستەدا دەردەكەون و جێگۆڕكێ دەكەن بە پێی مەبەست ٠

**لەو ئامرازانە :**

١ ــ ئامرازی نەفی (ڕوونەدان) •

٢ ــ ئامرازی نەهی (ئەمری ڕوونەداو) •

٣ ــ ئامرازی کۆ •

٤ ــ ئامرازی ناوی تاکی ناسراو •
ئامرازی ناوی تاکی نەناسراو •

٥ ــ ئامـــرازی فرمانی بـــکەری نادیـــار و لە ڕابـــوردوو و ئێستا و داهاتوودا •

٦ ــ ئەو ئامرازانەی حاڵات دروست دەکەن •

٧ ــ ئامرازی پرسیار •

٨ ــ تکا و داخوازی •

٩ ــ ئامرازی بچووکناو(●) •

١٠ــ ئامرازی مەرج •

١١ــ ئامرازی سەرسوڕمان •

١٢ــ ئامرازی بانگکردن •

١٣ــ ئامرازی ئاگاداری •

... هتد •

**ئامراز (اداة) :**

وەسیلەیە ، یارمەتیدەرە بـۆ گەیاندنی مەبەست و درووونی وشەکانی ناو ڕستە بە پێی پێویست بە یەکەوە •

ئەگەر بتوانین وەڵامی پرسیارەکانی سەرەوە و لاپەڕەکانی پێشوو بە شێوەیێکی باش بدەینەوە بەڵگەی تێگەیشتنی باسەکەیە،

---

(●) هەندێك لەمانە پاشگریشن چونکە ناوی تازە دروست دەکەن وەك :
تیر ــ تیرۆك ، مێش ــ مێشوولە ، تیرۆك ــــ تیر بچووك

تا پرسیار کـەم ببێتەوە بەرەو تێگەیشتن دەڕۆین و دەگەیـن بە ئەنجامێکی باش •

چاکترین بەڵگەی تێگەیشتنیش ئەوەیە :

١ ـ ناسـینی بە تـەواوی زانینی بەکارهێنانی لـە شوێنی خۆیدا •

٢ ـ تێکەڵ نەکردنی لەگەڵ پێشگر و پاشگر و ڕاناو •

٣ ـ جوداکردنەوەی ئەو ئامرازانەی بە ڕووالەت لە پێشگرو پاشگر دەچن و تێکـەڵ نەکردنیان ، ئەمــەش ئاسانە چونــکە بە گشتی :

أ ـ ئامراز پەیوەندیی بە رستەوە هەیەو لە رستەدا دەوری ڕوون دەبێتەوە •

ب ـ پێشگرو پاشگر لە وشەدا •

جـ ـ ڕاناو هەرچەندە وشەیە وەك ئامراز ، بەڵام بۆیە ئەم ناوانە بۆ ئەو وشانە دانراوە دیارە هەر یەکە تایبەتێتی خۆی و شوێنی خۆی هەیە لە زمان و ڕستەدا بەو پێیە پێناسین بـۆ هەریەکە دانراوە ، زانـین و تێگەیشتنی پێناسین زۆر گرنگە بۆ گەیشتن بەو ئەنجامە و نەمانی تەم و لێڵی لە هەر باسەدا •

## ڕاهێنان :

### ئامراز و وشەکانی‌تر :

وشەیە ، بەڵام ئایا دەتوانین وەك :

ناو ، ئاوەڵناو ، فرمــان ، ئاوەڵکار ، ڕاناو ، ناوی ژمارە

بەکاریان بهێنین ، یان بیانخەینە شوێنیان ؟

بەمە و بەم جۆرە تاقیکردنەوەیە نەك تەنیا لە ئامراز ئەوانەی سەرەوە بەشەکانی ئاخافتنن ، پێشگر و پاشگریان دەگەین بەڵکو لە هەموو بەشەکانی ئاخافتن ·

تێدا نیە ، کەواتە وشە نین ، ئەی چۆن دەبێت لەگەڵ وشە جودا نەکرێنەوە ·

ئەم ڕاهێنانانە وردی و ماوەی دەوێت ، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ بدەن هەنگاو بە هەنگاو لە سەری بڕۆن و تاقیبکەنەوە بەمە دەگەن بە ئەنجامی گشت باسەکانی ئەم کتێبە بە گشتی ·

بە توانینی بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیە و ڕوونکردنەوەی بەوەش دەگەن کە لە باسەکانی پێشوو گەیشتوون ، ئەوسا دەتوانن دڵنیابن کە دەتوانن بەبێ هەڵە بەکاریان بهێنن لە ڕستەدا ، لە ڕستەشدا هەڵە ناکەن چونکە دەزانن چ وشەیێك و بۆچی بەکاری دەهێنن ، هەروەها کاتێك خۆتان دەبینن لە نووسینیشدا هەڵە ناکەن چونکە ڕێزمان دەزانن ·

کردنی ئەم لاپەڕەیە بە پرسیار و شیکردنەوەی بە پێی باسەکان بۆ مامۆستا و قوتابی بەجێ دەهێڵین ·

## « ئامـــــــــراز »

لە هەموو زمانێکدا ئامراز هەیە بەم جۆرەش لە زمانی کوردیدا ، بەڵام لەگەڵ گرنگی خۆی و ئەو دەورە گرنگەی هەیەتی لەم زمانەدا ، لە باسکردن و لێکۆڵینەوەدا مافی خۆی نەدراوەتێ، بۆیە لێرەدا هەوڵی ئەوە دەدەین کە ئامراز ڕوون بکەینەوە بە

شێوەییێکی کورت و ڕوون بۆ ئەوەی بگەینە ئەنجامێکی پەسەند ·

**ئامراز ـ پێناسینی :**

دەوری لە زماندا و شوێنی لە ڕستەدا ·

ئامراز بەشێکە لە بەشەکانی ئاخافتن ، کەواتە ئامراز وشەیە ، وشەش کۆمەڵە دەنگێکی ڕێکخراوە بۆ مەبەستێك ، واتە کۆمەڵە دەنگێکی واتادارە ، بەڵام بە تەنیا ئەو واتایانە دەرناکەوێت بەڵکو لە ڕستەدا و لە ڕێی وشەکانی ڕستەوە ڕوون دەبێتەوە ، هەروەك واتای ڕستەش لە ڕێی ئامرازەوە دەردەکەوێت ·

گوتمان پەیوەندییێکی زۆر بەهێز هەیە لە نێوانی ئامراز و ڕستەدا ·

ئایا ئەو پەیوەندییە چیە ؟

ئەگەر سەرنجی ڕستە بدەین بە گشتی ڕستە نیە بێ ئامراز بێت ، جاریش هەیە لە ئامراز زیاتر لەو ڕستەیەدا بەرچاو دەکەوێت بۆ گرنگی ئامراز و گرنگی دەوری لە ڕستەدا ، با ئەو ئامرازانە لەڕستە بهێنینە دەرەوە دەبینین ڕستەکە هەڵدەوەشێتەوە هەر پارچە بەرگێك دەزووەکانی تێهەڵبکێشی وەهایە ، کەواتە ئامراز کۆڵەکەی ڕستەیە ، هەر وەك ڕێزمان بڕبڕاگەی زمانە و زمان بوونی نەتەوەیە ·

- بە ڕاکردن چوو بۆ ماڵەوە ·
- دەمەوێت بچم بەڵام ناتوانم ·
- لەم چیرۆکەدا زۆر وشەی جوان و پڕ مەبەست هەیە ·

ژمارەی ئامراز زۆرە لە کوردیدا ، بەڵام مەرج تەنیا لەو

ژماره زۆرییەدا نیە بەڵکو لە بڵاوبوونەوەیان بە ناو زمان و ڕستەی هەمە چەشنە و شوێن نیشانە کردنیان بە پێی ڕێ و شوێنێکی تایبەتی ، ئەوەی بیزانێت و فێری ببێت بێگومان لە هەڵە خۆی دەپارێزێت ، لە دروستکردنی ڕستەشدا سەردەکەوێت ••• بەڵێ ئەگەر بزانێت هەرچیە و بۆچی بەکار دێت و لەکوێ •

ئەم ئامرازانە لەناو خۆشیاندا دەچنە پاڵ یەك و یان کۆدەبنەوە لە ڕستەیێکدا بە گوێرەی پێویستی •

بە گشتی ئامراز بۆ ئەم مەبەستانە بەکار دێن :

١ ــ ئەو ئامرازانەی بە گشتی حاڵاتی ڕستەی کوردی دەردەخەن • ئەمەیان بە ڕاستی پشتگوێ خراوە ، یان یەکە یەکە لە هەر ئامرازە و پەیوەندیی بەوانی ترەوە باس نەکراوە بەڵکو تاکوتەرا و لەملاو لەولا باسیان هاتۆتەوە ، ئەمەش زۆری دەوێت لێرەدا کۆکردنەوە و باسکردنیان بە هیچ پێك نایێت ، بەڵکو سەربەخۆ لە کتێبێك زیاتر دەگرنەوە •

گوتمان بەو بەشە ئامرازە کە ئێمە لە ژێر باسی حاڵات لە زمانی کوردیدا ڕوونی دەکەینەوە و جار هەیە ناو نراوە ئامراز یان پیتی پێوەندی لەبەر ئەوەیە کە پێوەندیی نێوانی وشەکانی ناو ڕستە ڕوون دەکاتەوە •

لەم باسەدا هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەدەین :

١ ــ پەیوەندیی نێوانی ئامراز و (حاڵات) چیە ؟

٢ ــ پەیوەندیی نێوانی حاڵات و (مفهوم)ی ڕستە چیە ؟

٣ ـ ئەو حالاّتانە چین و ڕوونکردنەوە و ئامرازەکانیان ؟

٤ ـ باسکردنی هەندێکیان بە تەنیا ، بۆ ئەوەی خوێنەر بتوانێت بەو پێیە لەوانیتر بکۆڵێتەوە ٠

٥ ـ نیشانەکردنی بەشێك لەو ئامرازانەی بۆ مەبەستی تایبەتی بەکار دێن ٠

٦ ـ ئەوانەی پێکەوە لە ڕستەدا کۆدەبنەوە ٠

٠٠٠ هتد ٠

ئێستە بێینەوە سەر باسەکەمان ، کە باسی ئامرازی حالاّت و مەبەستەکانی رستەیە لە زمانی کوردیدا :

بۆ نموونە کە دەڵێین : کە هات دێم (مدلول)

بەلاّم : لە ماڵەوە هاتووم ٠ (لە کوێوە هاتوویت ؟) ئەم حاڵەتە جووڵانەوەی کاروکەسەکە دەردەخات لەم ڕستەیەدا ، واتە مەبەستی ڕستەکە روون دەکاتەوە بە یاریدەی هەندێك ئامراز ، جا ئەگەر ئەو ئامرازانە بناسین دەتوانین ئەو مەبەستانەش بناسین یان دروستیان بکەین ، چونکە ئامراز جۆری داڕشتنی رستەکە نیشان دەکات و لە ڕێگەی پرسیارەوە لە راستێتی ئەو داڕشتنانە دەگەین ، چونکە پرسیار چۆن بێت ڕستەکەش بەو جۆرە دەبێت ٠

جیاوازیی نێوانی (مدلول)ی ڕستەو مەبەستەکانی رستە لەوەدایە کەلە (مدلول) دا تێکڕا سەرنجی رستەکە دەدەین بزانین چیی دەوێت ؟ (تکا)یە (ئەمر)ە (داخوازی)یە ، یان (مەرجە)هتد

خۆزگە منیش لەوێ دەبووم

تا بتوانم لە هەوڵدان نەوەستم

له حالآتدا ئامرازەکان تاك تاك دوو دوو یان زیاتر له رستەدا کۆدەبنەوه بۆ ڕوو نکردنەوەی مەبەستی کەسەکە و جموجووڵی کارەکە ٠٠٠و دەتوانین هەموویان بخەینە شێوەی پرسیار بۆ تێگەیشتن ٠

له کەرکووکەوه تا موسڵ چوارسەعاتە ٠

له کەرکووکەوه تا موسڵ چەند سەعاتە ٠

رستەو وەلآم تەنیا جیاوازییان لەوەدایە ئەوەی پرسیاری دەربارە دەکرێت له پرسیارەکەدا ، له وەلآمدا دێتە جێگەی ئامرازی پرسیار : چەند ؟ چوار ٠٠

سەرنجی ئەم نموونانە بدەن :

| ئامراز | نموونەو پرسیارەکەی | |
|---|---|---|
| ١ ــ له | ● له بازاڕ بووم | |
| | له کوێ بوویت | دەرخستنی شوێن |
| | ● له هەولێر پەنیرو ماستی باش هەیه | |
| | ● له کوێ پەنیرو ماستی باش هەیه ؟ | |
| | ● له بەغدا جێنشین بوو | |
| | ● له کوێ جێنشین بوو ؟ کۆتایی جووله | |
| | ● له گۆشتەکەم خوارد | بەشێك |
| | ● له کتێبخانەیە ٠ | |
| | ● له کوێیە ؟ | دەرخستنی شوێن |
| | ● ئەم دۆلآبە له ساج دروست کراوە | جنس |
| | ● ئەم دۆلآبە له چی دروست کراوە ؟ | |

● سبەینێ لە ماڵەوە دەبم        بوون

● لەبەر ماندوویی        هۆ

نانم پێ ناخورێت

● لەبەر چی ؟ ..

● لە بازاڕەوە هاتم بۆ لات

● لە کوێوە ؟        سەرەتای جووڵە

لە..وە..تا        لە ماڵەوە تا قوتابخانە        سەرەتاو کۆتایی

بە پێ چووم        جووڵانەوە

لە..وە..تا..        لێرەوە تا ماڵی ئێوە نیو        ماوە

سەعاتە

لێرەوە تا ماڵی ئێوە چەند

سەعاتە ؟

لە ... دا        ئەم ساڵ لە ئیشەکەیدا باشە

لە کتێبخانەکە کتێبی باش        لەناو

هەیە

لە جەژندا دەچمەوە بۆ ماڵ

لە...را        لە باژێرێڕا هاتم

لە...وە        لە باژێڕەوە هاتم

بە        گەیشتیت بە چی        ئەنجام

بە        بە باشی گەیشت        دەرخستنی حاڵ

بە شەوو بە ڕۆژ کار دەکات

سەفەر بە کۆمەڵی و بە حاڵ و کات
شەو خۆشە
بەفیفی بەراعەت لێی سوێند
بەسەر ناچێت
بە ناوی خودا بۆدەست کردن بەدەر
یا خودا
گەزی ئەم سورمەیە بە دوو نرخ
دینارە
گەزی ئەم سورمەیە بە
چەندە ؟
هەر دارە دەبێت بە دەوەن گۆڕڕان لە
ترێ دەکرێت بە سرکە حاڵەتێکەوە بۆ
شیر دەبێت بە ماست حاڵەتێکی تر ٠
ژوور بە ژوور و قوژبن بە جوڵانەوەیێکی
قوژبن و کوناوکون یەك لە دوای یەك
گەڕام نەمدۆزییەوە (تەرتیبی)
بە٠٠٠وە بە پێوە نان دەخوات (حاڵ)
بە سەر پێوە سەری لێداین
بۆ تەنیا و دڵنیا دەڕۆن بۆ کۆتایی
سۆلاف جوولانە
بۆ٠٠٠بۆ ئەوەندەی بۆ تۆ و دابەش‌کردن

ئەوەندەشی بۆ ئەو

بۆ | بۆ تۆ نەبێت نایکەم | لەبەر
بۆ | بۆ دەرناکەویت ؟ |

پاش نان خواردن دەچێتە هاومەبەستی دەرەوە (٩)یە

بۆ | پاش نان خواردن دەچێت بۆ دەرەوە |

تا | تا ئەو دووکانە چووم | کۆتایی جوولە

تا بەڵێنم نەدەیتێ پێت ناڵێم مەرج

تا پێت دەکرێت پەلە مەکە کاکردن لە سەرخۆ

تا دێت باشتر دەبێت ئەنجام و بەردەوامی

بەیانی تا ئێوارە هەر کار خەریکە

چووم تا بۆت بێنم هۆ

**ڕاهێنان :**

١ ـ هەوڵبدەن کەلەڕێی پارچەی هەڵبژێرراوەوە یانقسەی ڕۆژانە ئەم جۆرە ڕستانە کۆبکەنەوە و دابەشیان بکەن :

ا ـ بە سەر مەبەستەکاندا ٠

ب ـ بە پێی ئەو ئامرازانەی بەکار هاتوون ٠

٢ ـ چ مەبەستێك یان ئامرازێك دێتە بەرچاو لێرەدا باس نەکراوە یان بەو جۆرە بەکار نەهاتووە نیشانەی بکە و پاشان

لەگەڵ باسەکە یەکیان بخە و یەك ئەنجامیان بۆ دابنێ ٠

٣ ـ هەر مەبەستە ، پرسیاری بۆ دابنێن و بەراوردیان بکەن٠

## پیت و ئامرازی بەستنەوە

بەوانە دەگوترێت لە دوو وشە یان دوو ڕستە بەیەکەوە ٠

و سوولاف و زاویتە دوو شوێنی دڵتەزێنن
ئەم دەنووسێت و ئەو بۆی دەخوێنێتەوە
لە بەهار شەو و ڕۆژ دەبن بە یەك
نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب

ـ ئەمە بۆ نزیك و دوورخستنەوەش بەکاردێت :

وەك : گەرما و نوستن !
ناحەز و پاکی !
ژیان و نائومێدی !
هاوڕێ و وەفا
تێکۆشان و سەرکەوتن

ش منیش وەك تۆ تینووی سەرکەوتنم
منیش دوور لە نیشتمانەکەم هەڵناکەم

بەڵام ژیان سەختە بەڵام خۆشە
سیامەند زیرەکە بەڵام تەمەڵە

نەك دڵی مەشکێنە نەك نەیبینیتەوە
پێشتر بیر بکەنەوە نەوەك پەشیمان ببنەوە

نەبا بیری بخەنەوە نەبا لەبیری بچێت
(نەوەکا)

یان(یا) ئەم ئامرازە دوو ڕستە دەبەستێت پێکەوە لە (یاخو ، یاخو یاوەکو دەشێت واتای یەکێکیان بێتە دی ٠

نازانم بیر لە چی دەکاتەوە لە ڕۆیشتن یان لە مانەوە
ئەوەندە تەگەرەی تێمەخە یان وازی لێ بهێنە یان ناوی
خودای لێ بهێنە ٠
٠٠٠ هتد ٠

## ڕاهێنان :

١ ــ بۆ هەر یەکە (دە) ڕستە بهێننەوە بە مەرجێك هەمە چەشنە و بۆ کاتەکان بن پاشان بەراوردییان بکەن لەگەڵ ئەوانی سەرەوەدا و ئەنجامیان بۆ دابنێن ٠

٢ ــ سەرنجی هەر ئامرازە بدەن کە لەو ڕستانەدا هاتوونەتەوە و مەبەستەکەی و واتاکەی لێك بدەنەوە ٠

٣ ــ بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەیێك زیاتر کە لەم باسە دواوە و بەراوردییان بکە ٠

٤ ــ بۆ ڕاهاتن پارچە هەڵبژێرراو بخوێننەوە و ئەو ڕستانەیان لێ دەربهێنن کە لەگەڵ ئەو مەبەستانەی سەرەوەدا دەگونجێت ٠

## ئامرازی پرسیار

١ ــ کێ بۆ مرۆڤ :
کێ دەزانێت چوو بۆ کوێ ؟
٢ ــ چی بۆ گیان لە بەرو شت ٠

ئەوە چیە ؟

چیی بە دەستەوەیە ؟

٣ ـ چ　　چ کاتێك دەستت بە تاڵە ؟

چ زمانێك باش دەزانیت ؟

٤ ـ ئاخۆ　　ئاخۆ گەیشتبێتە کوێ ؟

٥ ـ کەی　　کەی هەست دەکات ؟

(کەنگی)

٦ ـ چۆن　　چۆن هاورێیەتی وا دەبێت ؟ !

(چلۆن)

٧ ـ بۆ　　بۆ لێی نا پرسیتەوە ؟

لۆ = (لە+بۆ) یە

٨ ـ بۆچی　　بۆچی پێشتر نای ناسیت ؟

لۆچی + چی　　لۆچی پێشتر نای ناسیت ؟

ڵاچی　　چما پێشتر نای ناسیت ؟

چما　　چما پێشتر نای ناسیت ؟

کوێ　　کوێ بەباش دەزانیت ؟

(بۆشوێن)

لەکوێ　　لەکوێ بوو ؟

کوا　　کوایت ؟

کانێ　　شتەکان کوانێ لە کوێیە ؟

چەند بۆ ژمارە　　چەند زمان دەزانیت ؟

بەچەند　　بە چەند بێت باشە ؟

بۆ نرخ
کام ساڵ قوتابخانەی سەرەتاییت تەواو کرد ؟
کام هاومەبەست (چ) یە
تەوا کرد ؟
ئایا ئایا لە لەش ساغی خۆشتر هەیە ؟

## ڕاهێنان

١ ـ هەوڵی کـۆ کردنەوەی ئـامرازی پرسیار بدەن بەگەڕانەوە بۆ چەند سەرچاوەیێك •

٢ ـ پاشان هاومەبەستەکانیان بنووسن و بەڕستە دەری بخەن •

٣ ـ بەرا وردییان بکەن لە ڕووی داڕشتنەوە •

٤ ـ سەرنجی ئەو ئامرازانەی تریش بدەن کە لەگەڵیاندا بەکاردێت

## ئامرازی مەرج

ئامراز لـەبەر ئەوەی لـە وەسیلەیێکە بۆ دەربڕینی جۆرەها مەبەست بۆیە لە وشەکانی تر بەمە جودا دەبێتەوە ، هەروەك هەر وشەیە لەوی تر بە تایبەتێتی خۆی جیاواز دەکرێتەوە •

ئەگەر ئەگەر گوڵ نیت دڕکیش مەبە •

کە کە بە لێنی دا دەبێت بیباتە سەر •

تا تاماوەم هەر هەوڵ دەدەم و تێ دەکۆشم •

ئەگینا ئەم کـارە لەکیس خۆت مەدە ئەگینا پەشیمان دەبیتەوە •

## ڕاهێنان •

١ ـ هێنانەوە نموونەی زۆر بۆ هەر یەکە بەجێ دەهێڵین بۆ خوێنەر

بە دەرهێنانی ئەو نموونانە لــە کتێبێك دەربارە فۆلکلۆرو پەندی پێشینیان بێت ٠

٢ ــ هەر یەکە لەو ئامرازە بە چەند شێوە بەکار دێت بیان نووسن ٠

٣ ــ یەك بەیەکە واتای هەر ئامرازە لێك بدەنەوە لەو ڕستانەداو بە راوردییان بکە لەگەڵ یەك ٠

٤ ــ بگەڕینەوە بۆسەر چاوەیێك زیاترو باسی مەرجی تێدابێت تا باشتر تێی بگەن

## ئامرازی داخوازی

| | |
|---|---|
| خۆزگە | خۆزگە هەموو کەسێك بە خۆشی دەژیا ٠ |
| (خۆری ، خۆیا) | خۆزگەم بە خاوەن هاوڕێی گیانی بە کیانی |
| بڕیا | بڕیا ئەو نامەی پێدا دەنارد ٠ |
| کاشکی | کاشکی دڵم نەدەشکاند |
| | کاشکی چاوی لێ بپۆشیایە |
| بەڵکو | بەڵکو بەم زووانە ئەنجامێکت دەستگیربێت |
| بەشکو | بەشکو ئەمە خووایە ئەمجارەش دەرچێت |

تێبینیو ڕاهێنان :

ئێمە مەبەستمان ئەوە نیە هــەرچی مەبەست و ئامراز هەیە کۆیکەینەوە ، بەڵکو ناسینی ئامــراز و چۆنێتی جوداکردنەوە و دەست نیشانە کردنی مەبەستەکانە ٠

بۆیە ئامرازەکانی تر و مەبەســتەکانیان بۆ خوێنەر بەجێ دەهێڵین کــە باســەکە فراوانتــر بــکات و بگەڕێتــەوە بــۆ ئەو

سەرچاوانەی پەیوەندییان هەیە پێیانەوە ٠

٢ ـ نەفی و (حەسرەت) و (سەرسوڕمان) و (نداء) و (نەهی) و ئاگاداری و مەبەستەکانی تر لە بیر مەکەن ، چۆن پێك دێتو بە یاریدەی چ ئامرازێك ؟ لەگەڵ پەیوەندیو جیاوازییان٠

٣ ـ بیانگۆڕنەوە بۆ کاتەکان و بزانن بۆ کام کات نابێت و بۆ ؟ پاشان سەرنجی کاتەکە و جۆری داڕشتنەکە بدەن بزانن دەگونجێن لەگەڵ یەك یان نا ؟ وە بۆ ؟

٤ ـ هەن بە جۆرێك زیاتر دەردەبڕرێن تاقییان بکەنەوە ؟

پێش کۆتایی هێنان بەم باسە دەڵێین :

هەر باسە پێویستیی بە ئەنجامێکە ، ئەنجامی باسی ئامرازو مەبەستەکانی چیە بیاننووسە بە شێوەیێکی ورد و ڕێك پاش وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ڕاهێنان ٠

**سەرنج :**

دەوری ئامراز هەر ئەوە نیە کە باسمان کرد بەڵکو لەناو خۆیاندا هاوواتا و دژواتایان هەیە یان هەن بۆ مەبەستێك زیاتر بەکار دێن ، یان جێگۆڕکێ دەکەن بەمە زمان و مەبەستەکانی فراوانتر دەکەن ، هەشن بە تەنیا و هەشن پێکەوە ، وەك ئامرازێکی لێکدراو دەچنەوە ڕستە بۆ دروستکردنی مەبەستێك کە بە تەنیا بە یەکێکیان پێك نایێت ٠

هەروەها پێشتر گوتمان کە ئامراز پەیوەندیی بە ڕستەوە هەیە و لە ڕستەدا واتای ڕوون دەبێتەوە و (وەسیلە) بۆ دەربڕین و دروست بوونی ئەو مەبەستانە ، بەمەش لە وشەکانی تر جودا دەبێتەوە هەرچەندە هەموویان لە بەشەکانی (ئاخافتن)ن

بەلاَم بە فێربوون و ڕاهاتن دەناسرێنەوە و لە واتاکانیان دەگەین دوور لە ڕستە بۆیە دەڵێین ئەگەر مەبەست ئەمە ئەم ئامرازە چییەتی ، یان ئەم ئامرازە ئەم مەبەستە ڕوون دەکاتەوە •

هەروەها لە پاش گشت ئەوانەشدا ئامراز تەنیا بەوە ناوەستێت بەڵکو دەورێکی باشی هەیە لە زمانی کوردیدا بۆ دروست کردنی وشەو واتای نوێی لێکدراو بە دەیەها کە لەناو خۆیاندا دەبن بە هاوواتاو دژواتا ، یان واتایێك زیاتر دەبەخشن •

بۆ نموونە سەرنجی ئەم لیستە بچووکەی خوارەوە بدەن و خۆتان لیستەکە گەورەو فراوان بکە ، وەك فەرهەنگۆکێك بە دانانی وشەی لێکدراوی تر بە یاریدەی ئامرازو دانانی هاومەبەستو دژواتاو ئەوانەی واتایێك زیاتر دەبەخشن بەلای یەکەوە •

| | نـا | نه | بە ــ بێ |
|---|---|---|---|
| ڕەسەن | ناڕەسەن | | |
| هات | | نەهات | |
| دیو | | نەدیو | |
| خۆش | ناخۆش | نەخۆش | |
| دیار | نادیار | | |
| پاك | ناپاك | | |
| حەز | ناحەز | | |
| یار | | نەیار | |
| | | نەفام | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ناسیاو | | نه ناسیاو | |
| | | نەبەز | |
| | | نەزۆك | |
| مان | | نەمان | |
| مردن | | نەمر | |
| كۆك | ناكۆك | | |
| شارەزا | | نەشارەز | |
| هەنگ | | نەهەنگ | |
| كۆڵدەر | | كۆڵنەدەر | بەكەڵك ، بێكەڵك |
| كەڵك | | | بەبەخت ، بێ بەخت |
| بەخت | | | (بەختیار) |
| جەرگ | | | بە جەرگ |
| ئومێد | نائومێد | | |
| چار | ناچار | | |
| ساغ | ناساغ | | |
| پیاو | ناپیاو | | |

| | نا | نه | به | بێ |
|---|---|---|---|---|
| زەبر | | | بەزەبر | |
| سوود | | | بەسوود | بێسوود |
| مەرد | نامەرد | | | |
| زار | | | | بێزار |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| خوێندەوار | نەخوێندەوار | | | |
| کار | | | | بێ کار |
| ڕەوا | ناڕەوا | | | |
| زانین | | | | |
| دڵ | نابەدڵ | نەزان | بەدڵ | |
| جێ | نابەجێ | | | |
| ماقووڵ (معقول) | ناماقووڵ | | | |
| پەسەند | ناپەسەند | | | |
| جسن (جنس) | ناجسن | | | |
| هەموار | ناهەموار | | | |
| بار | نالەبار | | | |
| کات | ناکات (ناکاو) | | | |
| بەخت | | | بەبەخت ، | بێ بەخت |

## وشەو زاراوەکان

١ ــ چاوگ •

٢ ــ پێناسین •

٣ ــ پێناسینی گشتی •

٤ ــ پێناسینی تایبەتی •

٥ ــ سەرچاوە •

٦ ــ تایبەتیەکانی چاوگ •

٧ ـ نوونی چاوگ ٠
٨ ـ نیشانەی چاوگ ٠
٩ ـ رەگی چاوگ ٠
١٠ـ بناغەی چاوگ ٠
١١ ـ چاوکی تێنەپەڕی بنجی ٠
١٢ ـ چاوك تێپەڕی بنجی ٠
١٣ ـ چاوکی تێپەڕی دروست کراو ٠
١٤ ـ چاوکی تێنەپەڕی دروستکراو ٠
١٥ ـ چاوکی هاوواتا ٠
١٦ ـ چاوکی دژواتا ٠
١٧ ـ پاشگری (اندن ـ ) ٠
١٨ ـ فرمان ٠
١٩ ـ کار ٠
٢٠ ـ بناغەی فرمان ٠
٢١ ـ بناغەی فرمان بۆکاتی ڕابوردوو ٠
٢٢ ـ بناغەی فرمان بۆکاتی ئێستاو داهاتوو ٠
٢٣ ـ ڕەگی فرمان ٠
٢٤ ـ ئاڵوگۆڕ ٠
٢٥ـ جێگۆڕکێ ٠
٢٦ ـ دروست کردن ٠
٢٧ ـ کاتەکان ٠
٢٨ ـ وشەی نوێ ٠

٢٩ ـ بنكه ٠

٣٠ ـ ڕێزمان ٠

٣١ ـ ڕاهێنان ٠

٣٢ ـ فرمانی تێنه پەڕی بنجی ٠

٣٣ ـ فرمانی تێپەڕی بنجی ٠

٣٤ ـ فرمانی تێپەڕی دروست کراو ٠

٣٥ ـ فرمانی تێنەپەڕی دروست کراو ٠

٣٦ ـ جیاوازی ٠

٣٧ ـ کۆتایی ٠

ی ی ی ی ی

٣٨ ـ پێوەندی ٠

٣٩ ـ ڕووالەت ٠

٤٠ ـ پێکهاتن ٠

٤١ ـ ساده ٠

٤٢ ـ ناساده ٠

٤٣ ـ داڕێژراو ، دروست کراو ٠

٤٤ ـ چۆنێتی ٠

٤٥ ـ پێشگر ٠

٤٦ ـ پاشگر ٠

٤٧ ـ فرمانی یارمەتیدەر ٠

٤٨ ـ گۆڕین ٠

٤٩ ـ ناوی دەنگ ٠

٥٠ ـ جووته وشه ٠

٥١ ـ فرمانی بکەر نادیار •

٥٢ ـ فرمانی بکەر دیار •

٥٣ ـ بکەر •

٥٤ ـ دیار •

٥٥ ـ نادیار •

٥٦ ـ هۆ •

٥٧ ـ ئامراز •

٥٨ ـ بەراوردی •

٥٩ ـ ئاوەڵکاو •

٦٠ ـ بەشەکان •

٦١ ـ ئاوەڵکاری کات •

٦٢ ئاوەڵکاری شوێن •

٦٣ ـ ڕستە •

٦٤ ـ تێکەڵ کردن •

٦٥ ـ ئاوەڵناو •

٦٦ ـ تێبینی •

٦٧ ـ ژمارە •

٦٨ ـ ناوی ژمارە •

٦٩ ـ ژمارەبنجی •

٧٠ ـ ژمارەی ڕێکخراو •

٧١ ـ ژمارەی دابەش کراو •

٧٢ ـ كەرتە ژمارە ٠
٧٣ ـ دەربڕین ٠
٧٤ ـ ئەنجام ٠
٧٥ ـ ئافیکس ٠
٦٧ ـ بەکار هێنان ٠
٧٧ ـ مەبەست ٠
٧٨ ـ بەستنەوە ٠
٧٩ ـ ئامرازی پرسیار ٠
٨٠ ـ ئامرازی مەرج ٠
٨١ ـ ئامرازی داخوازی ٠
٨٢ ـ ئامرازی بانگ کردن ٠
٨٣ ـ ئامرازی سەرسوڕمـــان ٠
٨٤ ـ ئامرازی ئاگاداری ٠
٨٥ ـ سەرنج ٠
٨٦ ـ ناوەرۆك ٠
٨٧ ـ پێرست ٠
٨٨ ـ سەرچاوە کان ٠

## سەرچاوەکان

١ ــ د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا
بەغدا ، ١٩٧٧ .
٢ ــ تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جیزمی یەکەم ،
بەغدا ، ١٩٢٩ .
٣ ــ د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ،
١٩٧٦ .
٤ ــ د. ج. خ. باکاییف ، زمانی کوردەکانی یەکێتی سۆڤێت ،
مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .
٥ ــ د. قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ، لینینگراد ،
١٩٥٧ .
٦ ــ د. قەناتی کوردۆ ، زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .
٧ ــ د. ك. ئەیوبی و آ. ی. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری
لینینگراد ، ١٩٦٨ .
٨ ــ کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەغدا ،
١٩٧٦ .
٩ ــ نوری عەلی ئەمین ، قەواعیدی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم،
١٩٥٦ .
١٠ــ نوری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی، بەرگی دووەم،
١٩٥٨ .
١٩٥٨ .
١١ــ نوری عەلی ئەمین ، گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی ،

## ناوەرۆك


| بابەت | لاپەرە |
| --- | --- |
| پێشەكی | ٣ |
| وشە | ٥ |
| ناو | ١٠ |
| جێناو | ٥٩ |
| ئاوەڵناو | ٧٥ |
| چاوگ | ٩٥ |
| درمان | ١٠٨ |
| ئاوەڵكار | ١٦٧ |
| ئامراز | ١٨٩ |

